# منداڵی ئاخر زەمان

نووسینی

**عەزیز نەسین**

وەرگێڕانی لە فارسییەوە بۆ کوردی

**غەریب پشدەری**

کوردستان ـ هەولێر

2005


**ناوی کتێب**: منداڵی ئاخر زەمان

- نووسینی: عەزیز نەسین
- وەرگێڕانی: غەریب پشدەری
- نەخشەسازی ناوەوە: طـــە حسین
- بەرگ: سەیوان
- پیتچنین: کاوە حسین
- تیراژ: 1000 دانە
- ژمارەی سپاردن: (318)
- چاپی یەکەم: هەولێر 2005
- نرخ: (2500) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب: -25- (127)



**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن: 2260311**

www. Mukiryani.com




**پێشکەشە بە:**

1- تێکڕای دایك و باوکان و مامۆستا و بەڕێوبەرو سەرپەرشتیارو ئەوجا بە هەموو منداڵە بێنازەکانی وڵاتە خۆشەویستەکەم.

2- دەست و پەنجەو چاوە ئەلیزابییەکانی مامۆستای هونەرمەند: خاتوو ((شەرا))ی ئازیزم.

وەرگێڕ

# یەکەم نامە

ئەنقەرە: (12)ی ئۆکتۆبەری 1966

برام ئەحمەد ئەگەر لەبیرت بێ، کاتێ خەریك بووم لە ئەستەمبۆڵەوە بەرەو ئێرە بەڕێ کەوم گوتم: (بە ڕێکوپێکی نامەتان بۆ دەنووسم) بەڵام تۆ باوەڕت پێ نەکردم و گوتت: (لە ئەنقەرە دۆست و هاوەڵی تازە پەیدا دەکەی و ئێمەت لەبیر دەچێتەوە) چاوت لێیە لەبیریشم نەکردیت و لەسەر قسەی خۆشم هەر مامەوە، خۆ ئەگەر نامەشم کەمێك دواکەوتبێ ئەوا لە هۆی چەرمەسەریی ڕێگا بەولاوە هیچی دی نییە.

چەند رۆژێکیش سەرقاڵی ماڵ رێکخستنێ بووین و دوو سێ ڕۆژیشی خایاند تا لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ئێرە وەرگیرام. هەر کە کەوتمەوە شێنەییە یەکەمین کارم ئەوەبوو دەستم دایە قەڵەم و کەوتمە نووسینی ئەو نامەیە بۆ ئێوە، خوا ئاگادارە کە هەرگیز نەمدەویست لێتان جیا ببمەوە. خۆ هەر نەبێ چوار ساڵ هاوپۆل و ئۆگری یەکتر بوو بووین، بەڵام کە باوکم بۆ ئەنقەرە گوێزرایەوە ناچار مام کە ئەو ناوەندە گەرموگوڕە دۆستانەیە بەجێ بێڵم... کاتێ کە لە ئەستەنبۆڵ بووم پێم گوتی کە دۆستە نزیکەکانی باوکم کارێکی باشیان لە ئەنقەرە بۆ دۆزیوەتەوە. باوکم لەگەڵ سێ کۆنە دۆستی خۆیدا لە کۆمپانیایەکی بازرگانیدا پێکەوە کاردەکەن و هەرسێك لاشمان پێکەوە لەیەك ئاپارتمان (شوققە) داین. ئەوانیش هەریەکەو چەند منداڵێکیان هەیە، بە تێکڕایی نۆ منداڵ دەخانوێکیداین، پێنجمان دەچینە یەك قوتابخانە، من و دووانیان لە پۆلێکین، مەتینی براشم ئاوەڵی تازەی دیتوونەوە، واش بڕیار بوو تەواوی ئەو بەسەرهاتە خۆش و ناخۆشانەی کە بەسەرمان دێن و ڕوو دەدەن بۆ یەکتریان



بنووسین، هێشتا تازە گەیشتوومە جێ و هیچ شتێکی تازەی وام پێش نەهاتووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە لەو چەند هەفتانەی دادێن، لەو شارە گەورەیەدا بەسەرهات و ڕووداوی سەرنج ڕاکێش پەیدا هەر دەکەم و بۆت دەنووسم. ئومێدەوارم تۆش هەر لەسەر پەیمان و قسەی خۆت مابی. زۆر زووم وەڵام بدەیەوە لەبارەی ئەو کاروبارو بەسەرهاتە خۆشانەی کە دوای من ڕوویان داوە بە درێژی بۆم بنووسە و ئاگادارم بکەوە، ئاوەڵانی ئەستەمبۆڵیشم لەبیر نەچوونەتەوە، لە زمانی منەوە سڵاو بە هەمووان ڕاگەیەنەو داواکاری سەرکەوتنی هەمووانم.

**چاوەڕوانی وەڵامتانم**

**ئاوەڵی هاوپۆلت: زەینەب یالکەر**





## هەرچی تا ئێستا فێری بوو ون لە بیر خۆتانی بەرنەوە

ئەستەمبۆڵ (17)ی ئۆکتۆبەری 1966

ئاواڵی خۆشەویستم زەینەب، کە نامەکەتم پێگەیشت زۆر پێی خۆشحاڵ بووم. ئافەرین هەربژیت کە ئاوەڵەکانت لەبیر نەچۆتەوە، هەر دەبێ واشبێ، کە تۆ لێرە ڕۆیشتی گەلێ کەس دەیانگوت: (فلانی... ڕۆیشت تازە هەر ئاوڕیش ناداتەوە)) بەتایبەتی چونکە درەنگ نامەت هات. زۆربەی ئاوەڵەکان توانجیان تێدەگرتم، بەڵام ئێستا دەتوانم بەسەر بڵندییەوە پڕ بە چاوانیان تەماشاکەم. نامەکەتم لەناو پۆلێدا بۆ هەمووان خوێندەوە. تێکڕای دۆست و ئاوەڵەکان پێی دڵخۆش بوون، و داواشیان لێکردم کە سڵاوی وانیشت پێ بگەیەنمەوە.

من هەر لەسەر گفتی خۆم ماوم. کە لێرە هەر شتێك ڕووبدات بۆتی بنووسم... چەند ڕۆژێك دوای ڕۆیشتنی تۆ ڕووداوێك هاتە پێش کە هەموومانی غەمبارکرد.

مامۆستاکەمانیان بۆ شارێکی دی گواستەوە، لەبیرتە مامۆستایەکی چەند ڕووخۆش و مرۆڤێکی چەند میهرەبان و سالار بوو. هەموو برادەران بە بیستنی ئەم هەواڵە هەژان. کە ماڵئاوایی لێکردین زۆرم هەوڵ دا دان بە خۆمدا بگرم و فرمێسکەکانم ڕابگرم، بەڵام کە لە پۆل هاتە دەرێ و دەستی بەسەری دا هێنام خۆم پێ ڕانەگیرا و لە بۆڕەی گریانێم دا، ئەویش کوڵی هەستاو دوو سێ دڵۆپە فرمێسك بە گۆشەی چاوەکانیدا سەرەو ژێر بوون.

مامۆستا تازەکەمان پیاو بوو هەر کە بۆ یەکەمجار هاتە پۆلەوە، بۆ ئەوەی چاو ترسێنمان بکات و زەبرو زەنگی خۆی بنوێنێ تەواوی قوتابییەکانی یەکە یەکە



بانگ کردنە سەر تەختەو هەریەکەو پرسیارێکی لێکردن بەڵام وەڵامی هیچ کامێکیانی پەسەند نەکرد، بە پۆزێکی تایبەتییەوە کە پڕ بە دنیایەك دڵگیری و ئاخ و داخی لێ دەباری گوتی: سەد داخ تەمەنتان بە خەسار چووە:... باشە ئەم ماوەیە خەریکی چی بوو ون؟. خۆ دەمیر دەناسی؟ کە ئەو یەکێکە لە قوتابییە هەرە باشەکانی دنیایە! و هەرچی لە کتێبەکانماندایە وەکو ئاوێیان دەزانێ، لە قسەی مامۆستای تازە، زۆر دڵگیربوو و هەستا و گوتی: ((مامۆستا من تەنانەت یەك دانە هەڵەشم نییە)). بەڵام مامۆستا بە دەست ئاماژەی دانیشتنێی کردو گوتی: ((ئەوە خوێندن نییە. ئێوە شتێکی تووتی ئاسا فێربوو ون! ئەمە سوودی نییە!))، منداڵەکان تەمبەڵەکانیان لێدەرچێ، هەموو ئەمەیان پێناخۆش بوو، چونکە هەموانی بە هیچ نەزان دایە قەڵەم.

دەمیر نەیتوانی خۆی ڕاگرێ و گوتی: ((پێموایە من دەرسەکانم زۆر چاك تێگەیشتووم و ئەوەی من تووتی ئاسا نییە)) مامۆستا بە تەوسەوە زەردە خەنەیەکی کردو گوتی: ((لە وەڵامەکانتانڕا دیارە!)) دوایی لە ژوورێدا دەستی کرد بە ڕاوێچکان وەك ئەوەی لە مێشکی خۆیدا خەریکی کێشانی نەخشەیەك بێ... منداڵەکان هەناسەیان لە خۆ بڕیبوو و چاوەڕووانی ئەوە بوون بزانن سەرەنجامی کار دەگاتە کوێ... مامۆستا لە پڕ وەستا، ڕووی کردە منداڵەکان و بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی: ((منداڵینە یەکەم شتێك کە دەیکەن ئەوەیە... هەرچی تا ئێستا فێری بوو ون لەبیر خۆتانی بەرنەوەو سەر لە نوێ فێری ببنەوە... تێگەیشتن؟.)). دەمیر پەنجەی بەرز کردەوەو هەستایە سەر پێ: ((مامۆستا ئێمە ئەوەی خوێندوومانە و فێری بوو وین هەموو ئی ناو کتێبەکەمانە ئێستا چۆن لەبیر خۆمانیان بەرینەوەو سەر لەنوێ فێریان ببنەوە؟)). مامۆستا بەوە زۆر تووڕە بوو و بە سەریدا قیژاند ((گوتم ئەو فێربوونە هەمووی هەڵە بووە، پێویستە هەمووی لەبیر خۆتان بەرنەوەو سەرلەنوێ فێریان ببنەوە...و تەواو... ئیدی پێیناوێ! یەکەم وانەمان بەم شێوەیەو بەم قسانە تێپەڕی! کە زەنگی پشوودانی لێدا منداڵەکان بوون بە دوو





بەشەوە، کۆمەڵێك لاگری مامۆستای پێشوو و کۆمەڵێك لاگری مامۆستای تازە بوون... ڕاستیەکەی من بێ لایەن مامەوە.

ئەم کارەی مامۆستای تازە سوودی قوتابییە تەمبەڵەکانی پۆلی تێدا بوو، کاتێ کە وەڵامی پرسیارێکیان بە هەڵە بدابایەوە دەیانگوت ((مامۆستای پێشوو وای گوتووە!)). مامۆستای تازەش وەڵامی دەدایەوە ((ئەدی من پێم نەگوتوون کۆنەکانی خوێندووتانە لەبیر خۆتانی بەرنەوە...)). نازانم ئاخۆ ئەوە دەزانی یان نا کە لەبیرخۆبردنەوەی هەر شتێك زۆر گرانترە لە دووبارە فێربوونەوە... ئەم باسە بۆ قوتابییە زیرەکەکانیش بووە دەردە سەرییەکی زۆر گەورە، ڕۆژێك بەڕێوەبەری قوتابخانە هاتە ناو پۆلەوە... وانەی مێژوومان هەبوو... بەڕێوەبەر ویستی بزانێ چ فێر بوو وین، دەمیری بانگ کردە سەر تەختەو پرسی: سوڵتان سەلیم چ ساڵێك چووە سەر تەخت؟ دەمیر وەڵامی نەدایەوە. بەڕێوەبەر پرسی: ((کێ چاپی داهێنا؟)).

دەمیر دیسانەوە هەر متتەقی نەکردەوە. چونکە دەمیریشی دەناسی و دەیزانی یەکێکە لە قوتابییە وریا و زیرەکەکان پرسی: بۆ وەڵام نادەیەوە؟.

– لەبەر ئەوەی لەبیرم چۆتەوە ناتوانم وەڵام بدەمەوە، بەڕێوەبەر زۆری سەرسوڕماو پرسی ((کێ ئەمەریکای دۆزیەوە؟))

– مامۆستا لەبیرم چۆتەوە!...

– سەگسار... لەبیرم چۆتەوە یانی چی؟

– مامۆستا لەبیرم چۆتەوە.

بەڕێوەبەر کە زۆر تووڕە بوو نەڕاندی: ((هەر ژەهرە مارێکی دەزانی بیلێ...))

دەمیر زۆر لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە: ((پێشان هەموویم دەزانی، بەڵام ئێستا هەموویم لەبیر چۆتەوە)).



– بۆ؟

– مامۆستا فەرموویان هەرچی تا ئێستا فێری بوو ون لە بیر خۆتانی بەرنەوە.

بەڕێوەبەر منی بانگ کردە سەر تەختە،... هەرچیشی لەمن پرسی هەر هەمان وەڵامم دایەوە ((لەبیرم چۆتەوە... قوربان)).

بەڕێوەبەر لە پشت چاوێلکەکەیەوە سەیرێکی مامۆستای کردو بێ ئەوەی هیچ بڵێ لە پۆلێ چووە دەرێ.

مامۆستا دەستی بە وانەکە کردەوە: ((لەکوێ بووین؟ سوڵتان سەلیم زۆر ئیشوکاری گەورەی کردن!)).

سەعاتێکی تەواو ئەوەی کە لەمەوپێش خوێندبوومان هەمووی بۆ باس کردینەوەو ئێمەش هەر چەندە بیرمان دەکردەوە نەماندەزانی چۆن ئەو شتانەی کە لەمەوپێش فێری بوو بووین لە بیر خۆمانی بەرینەوەو فەرمایشتەکانی جەنابی مامۆستا فێر ببینەوە!.

کە زەنگی دەرەوەی لێدا تێکڕای قوتابییەکان لە دەوری من و دەمیر کۆبوونەوەو گوتیان: ((دەستخۆش! چاکتان کرد واتان وەڵامدایەوە...)) ئەڵبەتە من ڕاستییەکەم لە قوتابییەکان شاردبۆوە، کە بە ڕاستی وەڵامی پرسیارەکانی بەڕێوەبەرم نەدەزانی، چونکە ڕاستت دەوێ لە بیرم چووبۆوە، من لەخۆوە بیرم باش نییە و ڕێ و شوێنی مامۆستای تازەش ئەوەندەی دیکەی تێکدا بوو. و هەر ئەم باسەش دەرسێکی ئەوتۆی دامێ کە تا دوارۆژی ژیانم لەبیرم ناچێتەوە.

داخەکەم لێرە نەبووی تا لە پێکەنینا بپسێی...

شەوی یەك شەممەی رابردوو، بەبۆنەی دەستپێکردنەوەی ساڵی خوێندنی تازەوە لە قوتابخانە ئاهەنگمان هەبوو. زۆر لە مێژ بوو بەرنامەی ئاهەنگەکەیان ڕێکخستبوو، چەند کەسێك مۆسیقایان لێدەدا و یەکێکیش گۆرانی دەگوت.

بڕیار وابوو منیش ئەو هەڵبەستەی کە خۆم هەڵمبژاردبوو بۆ کەسوکاری قوتابییانی بخوێنمەوە هەڵبەستەکەشم لە کتێبی خوێندنەوەی پۆلی سێهەم دەرهێنابوو و لەسەردەمی مامۆستاکەی پێشوومان‌دا لەبەرم کردبوو، کە باسی مەڕو ئەو سوودانەی دەکرد کە ئەو گیاندارە بەستەزمانە بە ئادەمیزادیان دەبەخشێ. شیری دەخۆین و دونگەکەی دەکەین بە ڕۆن و گۆشتی دەخۆین و خورییەکەی بە پۆشاك و لەپێستەکەی پێڵاو دروستدەکەین و تەنانەت لە ئێسك و قشپلیشی سوود وەردەگرین.



## بەرخەکەم [1]

بابە سەیری ئەم بەرخە کە چەند جوانە... ڕۆڵە ئەوە بەرخی مەڕی خۆمانە

**تا دەگاتە:** خوری دەکەین بە جاجم و پۆپەشمین... بە بەرماڵ و جەواڵ و شاڵ و سەرزین

ئەم هەڵبەستەم دابۆوە مامۆستاکەی پێشوومان و خوێندبوویەوە و زۆریشی بە دڵ بوو. منیش ماوەیەك پێیەوە خەریك بوو بووم تا لەبەرم کردبوو. بەڵام کاتی ئاهەنگەکە ئەو لێرە نەماو مامۆستا تازەکەمان هات، بەرنامەی ئاهەنگەکەش سەر لەبەر گۆڕا. مامۆستای تازە پێی گوتم: ((کوا هەڵبەستەکەت بخوێنەرەوە بزانم چییە؟))

هەڵبەستەکەم خوێندەوە، نەك هەر بە دڵی نەبوو و پەسەندی نەکرد بەڵکو گاڵتەشی پێکردم و گوتی: ((ئەمە چۆن هەڵبەستێکە؟ ئەی من نەمگوت کۆنەکان بەلاوە بنێن؟)) هەڵبەستێك کە لە کتێبە تازەکەدا، کە دەربارەی ((نیشتمان بوو هێنای و گوتی: ((ئەمە لەبەرکە و بیخوێنەرەوە... زۆر چاکترە)).

بۆ من هیچ جیاوازییەکی نەبوو، تەنیا ناخۆشییەکەی ئەوە بوو کە ماوەی تەواوم نەبوو هەڵبەستی ((نیشتمان)) بەو هەموو گرانییەیەوە بە تەواوی لەبەر بکەم.

مامۆستا خۆی کتێبەکەی کردەوەو هەڵبەستەکەی بۆ خویندمەوە:

[1] ئەمە هەڵبەستی پیرەمێردی نەمرە، لە جیاتی فارسییەکەی، بە نموونە هێنراوەتەوە. - وەرگێڕ-





## ئەی وەتەن[1]

ئەی وەتەن مەفتونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە

وەختی بەندیی و ئەسارەت پێ بە بەندو کۆتەوە

من لە زیکرو فیکری تۆ غافڵ نەبووم وا تێنەگەی

حەپس و تێهەڵدان و زیللەت، تۆی لەبیر بردۆتەوە

هەروەها ئەم هەڵبەستە دوورو درێژیش بوو نزیکەی دە پازدە دێڕیش دەبوو. مامۆستا لەکاتی خوێندنەوییدا، بەتایبەتی دەنگی بەرز دەکردەوەو جار جارەش لە ژێرەوە بە تیلە چاوێك تەماشایەکی منیشی دەکرد، یانی تۆش دەبێ وەکو منی بخوێنیتەوە، ئەو شەوە تا بەیانی نەنوستم. سی چل جارم وەك مامۆستا فەرموو بووی ئاوا خوێندەوە مەشقم لەسەرکرد، بەیانی کە هاتمە قوتابخانە مامۆستا گوتی:

پێش ئەوەی بچیتە سەر شانۆ بۆمی بخوێنەرەوە بزانم چۆنت لەبەر کردووە! خوێندمەوە بەڵام پەسەندی نەکردو سەرێکی لەقاندو لەژێر لێوەوە گوتی ((نەبوو)).

خۆی جارێکی دیکەی سەرتا بەخوار بۆ خوێندمەوە و گوتی: ((ئاوای بخوێنەوە ئێ؟))

جاری دووەمیشم خوێندەوە هەر پەسەندی نەکردو گوتی:

[1] ئەمە هەڵبەستی شاعیری بەناوبانگ (بێکەس)ە بۆ نموونە لە جێی فارسییەکە هێنراوەتەوە. - وەرگێڕ-



کوڕی خۆم تۆ لەوانە دەچی کە لە کۆڵانێ ناو و نیشانی شوێنێك دەپرسن، شیعر خوێندنەوە وا نابێ، دەنگت بەرزو نزم کەو بیلەرێنەوە: هەندێ جاریش لەسەرخۆبە و لە هەندێ شوێنیشدا وەکو شێر بنەڕێنە!. هەندێ جاریش دەستی چەپەت بخەرە بەر کەمەرت و دەستی ڕاستت ڕاوەشێنە و!... لە کۆتایی هەموو دێڕێکیشدا دەنگت درێژ کەوەو بە توندی وەك سەری دوژمن پانکەیتەوە پێ لە زەوی دە.

زۆرم هەوڵ دا هەرچی مامۆستا فەرمووی موو بە موو بەجێیبانبێنم، دەستێکم وەبەرکەمەرم نا، و دەستەکەی دیشم بەرزکردەوەو هەرچی توانایەکم هەبوو لە گەرووی خۆمدا کۆ کردەوەو دەستم بە خوێندنەوەی کرد.

خوێندنەوەکەمی پەسەند کرد، بەڵام لە پێ بەزەویدادانەکەم قایل نەبوو و گوتی: ((توند پێ بەزەویدا بدە)).

هەرچەندەم توندتر پێ بە زەویدا دەدا، دیسانەوە هەر بە دڵی نەبوو و پەسەندی نەدەکرد. لە دواییدا هێندە تووڕە بوو، وای توند پێ بە زەویدادا پەنجەرەکانی هێنایە لەرزە.

- کوڕە ئاوای لێدە.
- گوتم مامۆستا جەنابت هەر نەبێ سەد کیلۆ دەبی، من بە کوڵك و پێستەوە چل و دوو کیلۆم، مامۆستاکەمان لەو قسەیە زیاتر تووڕە بوو و شیراندی:
- بە کێش و قورسایی نییە، پیاو دەبێ خۆی ((جەوهەر))ی هەبێ!

جا بۆ ئەوەی (جەوهەر)ی خۆی بنوێنێ، قاچی بەرز کردەوەو زۆر توندتر لە جاران بە زەویدادا. ناو ژووری پۆلەکەمان تەختە بەندە، تەختەکانیش هەموو کۆن و رزیون. کاتێ مامۆستا بەو توندییە پێی دا بە زەویدا، تەختەکان شکان و دەمیان کردەوەو قاچی مامۆستایان تێدا گیر بوو! پۆلی چوارەم کە لە ژێر





ئێمەوەیە لەو ڕمبە ڕمبە زەندەقیان چوو بوو، مامۆستاکەیان و چەند قوتابییەك بە ڕاکردن هاتنە سەرێ و پرسیان:

((بۆ خاتری خوا ئەوە چییە؟ چ بووە؟.))

مامۆستاکەمان کە بە شەلە شەل لە پۆلێ هاتە دەرێ گوتی:

– هیچ نییە، دەمویست قوتابییەکان فێری شیعر خوێندنەوە بکەم!.

کاتێ مامۆستا چووە دەرێ، دەبینم منیش ناتوانم باش بە ڕێیەدا برۆم، ئەوەندەم بە توندی پێ بەزەویدا دابوو گۆشتی پاژنەی پێم کوترابوو و نەمدەتوانی بینێمە زەوی!!.

لە دواییدا بە شەلە شەل و بەو هەموو ئێش و ژانەوە چوومە سەر شانۆ. ئەگەر ڕاستیشت دەوێ خۆم نەمتوانی بچمە سەرێ بەڵکە ئاوەڵەکانم پاڵیان دام!...

هۆڵەکە شەپۆلی دەدا، زۆربەی دایك و باوکی منداڵەکان هاتبوون. مامۆستاکەمان لە پشت پەردە دانیشتبوو و چاوەڕێ بوو ئەگەر هەڵەیەك بکەم لەسەرخۆ پێم بڵێ.

کاتێ هاتمە پێشی شانۆکەو سلاوم کردو ئیکلامم بۆ میوانان کرد، تێکڕا لە چەپڵەیان دا، هێندە شلەژام جارێ تا ماوەیەك هەر نەهاتمەوە سەر خۆم. کە سەریشم بلند کرد هەڵبەستی ((ئەی وەتەن))م کە بڕیار بوو بیخوێنمەوە لەبیر چۆتەوە! هەر هەڵبەستەکەی ((بەرخەکەم)) بوو کە وەك ئەستێرەی گەش لەبەر چاوم قووت دەبووەوەو دەدرەوشایەوە. لەجیاتی ئەوەی (کۆنەکان)م لەبیر بچێتەوە، (تازەکان)م لەبیر چوو بۆوە.

ئێستا خۆتان حاڵی ئەو کاتیم بێننە بەر چاوی خۆتان کە من لەسەر شانۆ وەستاوم و تەماشای ئەو خەڵکە دەکەم و ئەوانیش بە بەژن و باڵای مندا هەڵدەڕوانن. باش بوو مامۆستا فریام کەوت و لە دواوەڕا گوتی: ((ئەی



وەتەن...)) منیش زۆر بە گەرمییەوە هاوارم کرد ((ئەی وەتەن))... بەڵام هەڵبەستەکەم وەبیر هەر نەهاتەوە.

لەدڵی خۆمدا گوتم ((ئەگەر جارێکی دیش وشەی - ئەی وەتەن - بڵێمەوە ڕەنگە هەڵبەستەکەم وەبیر بێتەوە)). بەڵام بێسوود بوو. میوانەکان دەستیان بە چەپڵە لێدان کرد.

ئەمجارەیان هەر هێندەی دیم زیاتر خۆ لێ ونبوو. نەمدەزانی میوانەکان بۆ چەپڵە لێدەدەن! گوێم لە دەنگی مامۆستا بوو کە دەیگوت: ((ئەی وەتەن)). منیش هەروەکو ئەوم دووپات کردەوە ((ئەی وەتەن)) جاری دووەم و سێیەم هەر وشەی ((ئەی وەتەن))م گوتەوە بەڵام ئەوەی دیم بەبیر نەهاتەوە. مامۆستا زۆر توندتر لە جاران گوتی: ((گێلە، گوێت لە من بێ)).

بێ دەسەڵاتانە وەڵامم دایەوە: ((گوێم لێتە!!))

میوانەکان بە دەنگی بەرز لە قاقای پێکەنینیان دا، و مامۆستا لەسەر خۆ گوتی:

((ئەی وەتەن مەفتونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە))

دەستبەجێ هەڵبەستەکەم سەراپا وەبیر هاتەوەو زۆر بە دڵنیاییەوە دەستم پێکرد.

وام بە توندی پێ لە زەوی دا، یەکێك لە بزمارەکانی تەختەکانی شانۆکە بە بنی پێمدا چوو و هەر دوا بە دوای ووشەی ((شێوەتم بیرکەوتەوە)) یەك دانە ((ئۆف))ی توندم لەناخەوە لێ هەستا! دەنگی پێکەنینی دانیشتوان ئاسمانی کەڕ کرد، بەڵام من زۆری نەمابوو دەستکەمە گری... دوو چاوم هەبوون دووی دیکەشم قەرز کردن و بڕیمنە مامۆستا و تێیڕامام، تا بزانم دەڵێ چی، مامۆستا ئەمجارە هاواری کرد.

((وەختی بەندیی و ئەسارەت پێ بە بەندو کۆتەوە)).

منیش دەستبەجێ قسەکەیم قۆستەوە و گوتم:





((وەختی بەندیی و ئەسارەت پیێ بە بەندو پیێ بە بەندو... بەندو...)) وەك دەرزی قەوانی گرامافۆنێك كە بیگرێ بە حەپەساوییەوە ئەو وشەیەم زۆر بە كەساسیەوە هەر دەگوت و دەگوتەوە ((بەندو... بەندو))

مامۆستا لەو دیوەوە ددانی دەچیڕەوە بردن و گوتی:

((دێڕی دووەم بخوێنەرەوە.. من لە زیكرو فیكری تۆ غافڵ نەبووم وا تێنەگەی))

دەستبەجێ گوتم:

((من لە زیكرو فیكری تۆ غافڵ نەبووم وا تێنەگەی)) و دێڕێكم لە هەڵبەستی ((بەرخەكەم)) هاتەوە سەر زمانی و دوا بە دوای ئەو دێڕە هەڵبەستە هاوارم كرد:

((خوریی ئەكەین بە جاجم و پۆپەشمین))

هۆڵەكە لەبەر پێكەنین و چەپڵە ڕێزانی دانیشتوان هاتبووە لەرزە، یەكێك لەو دیو پەردەكەوە چمكی چاكەتەكەی گرتم و ڕایكێشامە خوارێ... مامۆستاكەشمان وەك بەوری برینداز بەسەریدا قیژاندم:

((گەلحۆ ئەمە چ شەكرێك بوو شكاندت؟))

– گوناهی من نەبوو، هەرچیەكم كرد كۆنەكان لەبیر كەم! سوودی نەبوو!!... مامۆستا، كە هەستی كرد قسەكەی لە جێی خۆی نییە، هیچی دیكەی نەگوت و هەردووكمان بە شەلە شەل كەوتینە ڕێ و ڕۆیشتین...

شەو لەماڵەوە باوكم گوتی:

– كوڕە ئەوە تۆ خاوەنی چ هونەرێكی و من نەمزانیوە!... خۆ ئەو خەڵكە خەریك بوون لە پێكەنینا بپسێن!

دایكیشم گوتی:

– هێندە پێكەنین چاومان پڕ ببوون لە ئاو، هێندەی نەمابوو دڵمان راوەستێ.



تێگەیشتم كە میوانەكانی ناو هۆڵەكە چۆن بە هەڵەدا چوو ون... ئەوان بەلای خۆیانەوە وایان زانیوە بەرنامەكە ئاوایە... نەیانزانیوە منی بێچارە لە چ ڕۆژە ڕەشیەكدا بوو وم.

بەڵێ زەینەب گیان چەند ڕۆژێكمان بەو هەراو زەنایەوە ڕابوارد...... ئومێدەوارم هەروەك بەڵێنت دابوو وەڵامی نامەم زوو بدەیتەوەو هەرچی ڕوو دەدات بۆم بنووسی.

**سەركەوتنت دەخوازم**

**ئاوەڵی هاوپۆلت – ئەحمەد تاربای**

## هەموو باوكان هەر یەكەمن!!..

ئەنقەرە 22ی ئۆكتۆبەری 1966

زۆر سوپاسی وەڵامەكەت دەكەم... تكا دەكەم هەموو جارێ نامەی ئاوا درێژم بۆ بنووسە... منیش هەرچی ڕوو بدات بۆتی دەنووسم..

تەواوی ئەو دەمەی نامەكەتم دەخوێندەوە سەرو سیمای دڵسۆزانەتم هەر لەبەر چاوان بوو... ئەو دیمەنەشم لەبەر چاوان بەرجەستە كردبوو كە لە سەر شانۆ وەستاوی و هەڵبەستەكەت لەبیر چۆتەوە، هێندە پێكەنیم هەر مەپرسە.

ئێستا منیش داستانێكی ئێرەت بۆ دەگێڕمەوە كە لە بەسەرهاتی ((قوتابخانە))كەی تۆ كەمتر نییە... ئێمە لێرە لە خانووێكی چوار نهۆمیدا دەژین... سێ نهۆمەكەی تری ئەم خانووەش ماڵی هاوكارەكانی باوكمی تێدان. ئەم ئاوەڵانەی باوكم دۆست و دڵسۆزی سەردەمی منداڵی یەكتری بوون و لە یەك قوتابخانەشدا خوێندوویانە... لە پشت خانووەكەشمانەوە باغچەیەكی گەورە هەیە كە باغچەی لێدەرچێ بە هەموو شتێكی دیكە دەچێ. دارو درەخت و گوڵ و ئەو شتانەی هیچ تێدانییە هەر بۆیەشە زۆر شادو دڵخۆشین، پاش نیوەڕۆیان بە سەربەستی و بێ ئەوەی كەس خۆیمان تێبگەیەنێ لەوێدا یاری دەكەین و دەربارەی ژیانی باوكانمان دەدوێین... زۆر جار ئەم باس و خواسانەمان بە هەراو هۆریا و شەڕ و ناخۆشی دوایی دێ، چونكە هەموو منداڵێك دەیەوێ بەوانیدی بسەلمێنێ كە باوكی ئەو لە باوكی هەموو ئەوانیدی زیرەكترە!.



بێگومان مەتینی برام دەناسی كە لە پۆلی سێهەم بوو ئەو لە هەمووان لەسەرترە... چەند ڕۆژێك لەمەو پێش كە ئەم باسە دەستی پێكردەوە مەتین قریشكاندی:

باوكی من لە باوكی هەمووتان زیرەكترە... ئەو كاتە كە لە قوتابخانە بوو ون باوكی من هەمیشە هەر یەكەم بووە...

كوڕی یەكێك لە ئاوەڵەكانی باوكیشم وەكو مەتین سینگی خۆی هێنایە پێشێ و تا تینی تێدابوو جڕتێكی بۆ لێدا!

مەتین هێندە تووڕە بوو نەبێتەوە، یەخەی كوڕەی گرت:

– تۆ هەر پیاو نیت!. ئەگەر باوەڕیش ناكەی بڕۆ لە باوكت بپرسە...

یەكێك لەهاو پۆلەكانی من كە كچێكی كورتە باڵای قژ ڕەشە پێشی پێگرتن و گوتی:

– بە خۆڕایی هەرایە مەكەن، باوكی من لە قوتابخانەدا هەمیشە ((یەكەم)) بووە...

مەتین لە كوڕەكە تەكییەوەو دەستیكرد بە گاڵتە پێكردنی هاوپۆلەكەی من:

– نە... بابە! درۆیان مەكە؟

– درۆزن خۆتی... باوكی من بە درێژایی تەمەنی هیچ كاتێك تەنانەت دووەمیش نەبووە... هەمیشە هەر یەكەم بووە... تێگەیشتی یان نا؟.

مەتین دیسانەوە لەسەرخۆ گوتی:

خەتای تۆ نییە... باوكت شتێكی گوتووە و تۆش باوەڕت كردووە!. یەكەم هەر باوكی من بووە نەك باوكی تۆ!.

كچە بە تووڕەییەكەوە قیژاندی:

– باوكی من هیچ كاتێك ناهێڵێ كەسی پێش كەوێتەوە!.

مەتین ڕووی كردە من:

– ئەرێ وانییە خوشكێ؟ ئایا هەمیشە هەر باوكمان یەكەم نەبووە؟ ئەی هەموو جارێ ناڵێ:((من هەر یەكەم بوو وم؟))

نەمدەزانی چ وەڵامێكیان بدەمەوە، لایەنی كامێكیانم دەگرت ئەویدیان زویر دەبوو. ناچار بۆ ئەوەی هەراكەیان بكوژێنمەوە گوتم:

– وازبێنن، هەریەكە چۆنی پێخۆشە با وا بیر بكاتەوە.

گێرمە و كێشەكە خەریك بوو تەواو دەبوو كە كوڕی یەكێكی دیكەی ئاوەڵەكانی باوكم خۆی دە قسانەوە گلاند و گوتی:

– هەمووتان وازبێنن، ڕاوەستن، نە باوكی تۆ یەكەم بووە و نەباوكی ئەو، قوتابی ((یەكەم))ی پۆل باوكی من بووە.

مەتین بە تەوسەوە گوتی:

– پفف! باوكت هەر قۆپییەچی بووە.

– باوكی خۆت قۆپییەچی بووە.

– باشە، تۆ چوزانی؟

– وەكو ڕۆژی ڕوون دیارە كە باوكی من یەكەم بووە...

بگرە و بەردەیەكی توندیان لە نێوانێدا پەیدا بوو... هێندە نەما بوو لێیان ببێتە هەرا... مەتین وەك گزكلی دەیویست بەسەرو چاوی كوڕەیدا هەڵپرژێ... دەستیم گرت و واوەم هێنا. دەستیكرد بە گریانێ. ناچار بۆ لای دایكم بەكێش كردەوە. مەتین بە دایكمی گوت: ((دایە ڕاستە، باوكم یەكەم نەبووە؟ قۆپییەچی بووە؟))

دایكم تووڕە بوو و بە سەریدا قریشكاند:



– ئەم قسانە چییە كوڕە؟ بێم بیبەری تیژت دەزاری كەم؟

مەتین بێدەنگ بوو. منیش بەمەبەستی دڵدانەوەی گوتم:

– باوكی ئێمە هەرگیز هاوپۆلی باوكی ئەوان نەبووە.

مەتین بە دەم گریانەوە وەڵامی دایەوە:

– ئەوان خۆیان دەیانگوت!

– لەوانەیە لە پۆلێكدا بوو بن... بەڵام قوتابخانەكانیان جیا بووە..

مەتین نەهاتە ژێر بارو گوتی:

باوكم دەڵێ بەیەكەوە لەناو یەك پۆلدا بووین...

ئێوارە كاتی نانخواردنێ لە باوكم پرسی:

– بابە، تۆ لەگەڵ ئاوەڵەكانتدا هاو پۆل بوو ون؟

– بەڵێ كچم، هەر چوارمان هاو پۆل بووین، پێنج ساڵی ڕەبەق لەسەر مێزێك دادەنیشتین لەبەر ئەوە دایكم بە براكەمی گوتبوو بیبەری تیژت دەزاری دەكەم نەوێرام هیچی دیكەی لێ بپرسم. بەڵام تا دەهات ئەم پرسیارە لە مێشكمدا قورستر دەبوو، دەبوایە ئەو گرێیەش هەر بكەمەوە. بەیانی لە قوتابخانە لە منداڵی یەكێك لە ئاوەڵەكانی باوكمم پرسی:

– باوكت پۆلەكانی خوێندنی قوتابخانەی چۆن دەبڕین؟

– باوكی من هەمیشە هەر یەكەمی پۆلەكەی بووە.

كوڕیژگەیەك لە پشت ئێمەوە دانیشتبوو و گوێی بۆ قسەكانمان هەڵخستبوو گوتی:

– باوكی منیش هەروا بووە...

لە پۆلەکەماندا تەنیا سێ کەس هەبوون کە باوکیان یەکەم نەبوون. دەنا ئەوانیدی هەموو دەیانگوت کە باوکیان لە قوتابخانە یەکەم بووە!!

دوو ڕۆژ دوای ئەم کێشەیە مامۆستاکەی مەتین، دایکمی بانگ کردە قوتابخانە و پێیڕاگەیاند کە کوڕەکەی ناخوێنێ. ئەو شەوە باوکم زۆری بە مەتین کرد، لە دواییشدا کەوتە ئامۆژگاری کردنی:

کوڕی خۆم تۆ بۆ لە باوکی خۆت ناکەیت؟! من لە سەردەمی قوتابییەتیمدا هەمیشە هەر یەکەمی پۆلەکەی خۆم بووم. جارێك نەبوو دووەم بم! شوورەیی نییە پیاو لە ئاوەڵەکانی دابڕێ؟ بۆ دەرسەکانت ئامادە ناکەیت؟ هەر نەبێ پەڕۆیەك لە من دادرە! سەیرکە ئاوەڵە کۆنەکانی هاوپۆلم، کە لەوان زیرەکتر بووم چەندم یارمەتی دەدەن. تەنیا بۆ ئەوەی لێیان نزیك بم منیان هێنایە ئەنقەرە و ئیشیان بۆ دۆزیومەوە، تۆش ئەگەر دەتەوێ پێشکەوی پێویستە هەمیشە یەکەم بیت...

ئیدی نەمتوانی خۆم ڕاگرم. گوتم:

– بابە هەرکاتێك ((مەتین)یش بوو بە باوك... ئەوسا ئەویش یەکەم دەردەچێ!.

دایکم تێگەیی مەبەستم چییە گوتی:

– کچێ هەی بێ ئابڕوو! ئاگات لە دەمت بێ. کاتێ کە گەورە قسان دەکا بچووکتر نابێ هەڵداتێ و قسان بکات.

باوکم ورتەی لێوە نەهات. وا دیاربوو خۆشی لەو درۆیەی کە کردبووی شەرمەزار ببۆوە!!.

بەڵێ ئەحمەد گیان. ئەم ڕووداوە لە تەپەسەرکردنێ باوکمی ڕزگار کردین.

سڵاوم بە هەموو ئاوەڵەکان بگەیەنە، ئیشاڵڵا لەو هەفتانەی کە نامەی دوور و درێژت بۆ دەنووسم.

**ئاوەڵت - زەینەب یالکەر**



## *ئەو وەستایەی ئەمەریکای دروستکرد!*

ئەستەمبۆڵ 28ی ئۆکتۆبەری 1966

ئاوەڵی خۆشەویستم زەینەب

دوو ڕۆژ لەمەو پێش نامەکەتم پێگەیشت و زۆری پێ شاد بووم.

پرسیبووت داخوا باوکی منیش یەکەم بووە یان نا؟. باوکی من تا ئێستا باسی شتی وای نەکردووە، دەزانی بۆ؟ چونکە ئەو هەرگیز نەچۆتە قوتابخانە تا یەکەم بێت!. هەر دوای وەڵامدانەوەی نامەکەت ڕووداوێك لە قوتابخانەکەمان ڕوویدا کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، ڕۆژێك بەیانی زوو بەڕێوەبەری قوتابخانە ئاگاداری کردینەوە کە سەرپەرشتیار دێت، ئەم هەواڵە هەروەکو بۆمبا لە قوتابخانەدا تەقییەوە... نە هەر تەنیا قوتابییەکان بەڵکە مامۆستاکانیش ڕەنگ و ڕوویان پێنەما. دەتگوت ئیزرائیل دێت.

ئێمە تا ئەو ڕۆژە سەرپەرشتیارمان نەدیبوو. نەمدەزانی سەرپەرشتیار چ دەکات و چ دەپرسێ!.. بەڵام مامۆستاکەمان دوو سێ جاری دیکە سەرپەرشتیاری دیبوو. لە کاتێکا کە زمانی گۆی نەدەکرد گوتی: ((منداڵینە هیچ نەترسن! خۆ سەرپەرشتیار خێو نییە، دوو سێ پرسیارتان لێدەکات. هەڵبەستێك، پرسیارێکی ماتماتیك (بیرکاری) یەکی جوگرافیا و مێژوو. ئێستاش قەڵەم و کاغەز دەرێنن چەند پرسیارێکتان پێدەڵێم بینوسنەوە، تا کاتێك کە سەرپەرشتیار هات و پرسیاری لێکردن بتوانن وەڵامی بدەنەوە..)) ئێمەی بێ دەسەڵاتیش قەڵەم و کاغەزمان دەرهێنا و مامۆستا دەستی پێکرد:

((پرسیاری یەکەم. ئەمەریکا لە چ ساڵێك دۆزرایەوە؟.))





هەموو پێکەوە گوتمان: ((لە ساڵی 1492))دا.

((بەڵێ ڕاستە. پرسیاری دووەم. لە جیهاندا کێتان لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ؟))

هەرکەسە بە جۆرێك وەڵامی ئەم پرسیارەمان دایەوە. یەکێك گوتی ((ئەتا تورك)) یەکێکی دی گوتی ((دایکم)) من گوتم ((باوکم)). مامۆستا هەر سێ وەڵامەکەی پەسەند کرد: ((زۆر باشە. هەموو راستن. بینووسن. پرسیاری سێهەم. کێ ئەستەمبۆڵی گرت؟))

((سوڵتان محەممەدی فاتیح)).

((ئافەرین. ئەمەش هەر بنووسن. پرسیاری چوارەم. کێ مزگەوتی سولەیمانییەی دروستکرد؟))

((وەستا سینا.))

((ئەمەش هەر ڕاستە. چەند جارێك پرسیار و وەڵامەکان بخوێننەوەو بە باشی لەبەریکەن)) هەڵبەستێکیشی بۆ خوێندینەوەو ماناکەشی بۆ لێکداینەوە. ئێمەش نووسیمانەوە. دوایی پرسیارێکی بیرکاری و وەڵامەکەی بۆ لەسەر تەختە ڕەشەکە نووسین و ئێمەش لە دەفتەرەکانماندا نوسیمانەوە. لە دواییدا گوتی:

((باشە منداڵینە ئێستا چەند جارێك وەڵامەکان بخوێننەوە تا باش بێتە بەرتان)). ئێمەش وەك مێش هەنگوینی دەوری خەڵێفێ کردمانەویزە ویز.

((ساڵی 1492. باوکم. سوڵتان محەمەدی فاتیح. وەستا سینا. ساڵی 1492. باوکم...))... سەرپەرشتیار خەریکی سەردانی پۆلەکانی دی بوو. نزیکی نیوەڕۆیە گەیشتە سەر پۆلەکەی ئێمە، بێدەنگییەکی قورس ژوورەکەی داگرتبوو. هەموو سەرمان بەردا بۆوە خوا خوامان بوو سەرپەرشتیار خۆیمان تێنەگەیەنێ.

سەرپەرشتیار تەماشای دەفتەری چەند قوتابییەکی کرد. هیچ هەڵەو چەوتییەکیان نەبوو بە مامۆستای گوت: ((قوتابی باشتان هەیە، دیارە زۆریان



پێوە ماندوو بوو ون!)). من هێندە ترس لێنیشتبوو بێ ئاگا پەڕەکانی دەفتەرەکەمم هەڵدەدانەوە! لەپڕ دیتم ئەوە سەرپەرشتیار بەسەر سەرمەوە ڕاوەستاوە. دەفتەرەکەمم بەرز کردەوەو پێش چاوی خۆمم پێگرت. سەرپەرشتیار پرسی:

ئەمە چییە؟

- هەڵبەستە قوربان...

- چ هەڵبەستێك؟

- هەڵبەستێك کە لەسەر فەرموودەی مامۆستا نوسیوومانەتەوە!

لە پڕ چاوم بە لاپەڕەی دەفتەرەکەم کەوت، لە جیاتی هەڵبەست ئەو پرسیارەی بیرکاری و وەڵامەکەیم پێشانی سەرپەرشتیار دابوو کە مامۆستا پێی گوتبووین...

سەرپەرشتیار بە کەمێ تووڕەییەوە پرسی:

- ئەدی هەڵبەستەکە کوا؟

لەژێرەوە تەماشایەکی مامۆستام کرد. لە تووڕەییاندا وەك هەڵووژەی سوور هەڵگەڕابوو، دەمویست ئەو لاپەڕەیە بکەمەوە کە هەڵبەستەکەم تێدا نوسیبۆوە، بەڵام مامۆستا بە چاوو بە برۆ ئاماژەی دەکرد. هەر چەند لێی ورد بوومەوە لە مەبەستی نەگەیشتم، ئەوە سەرپەرشتیاریش هەر چاوەڕێیە.

بە تێکەڵ و پێکەڵیەکەوە گوتم:

- بۆم نەکرا هەڵبەستەکە بنوسمەوە، قوربان.

سەرپەرشتیار بە مامۆستاکەی گوت:

- پرسیارێکیان دەیە حەلی کەن.

لەبەر ئەوەی سەرپەرشتیار وەڵامی ئەو پرسیارەی دیتبوو کە نوسیبوومانەوە، مامۆستا ناچار بوو پرسیارێکی ترمان بداتێ. زۆربەی زۆری قوتابیان نەیانتوانی پرسیارەکە حەلکەن. لە تەریقیان خەریك بوو ببمە ئاو. هەموو گوناهی من بوو کە ئەو هونەرەم نواندبوو. سەرپەرشتیاریش وەك تەنیا لەو پۆلەدا هەر من ببینێ پەنجەی بۆ ڕاکێشام: ((هەستە)). وەکو کێچ ڕاپەڕیم و هەستامە سەر پێ.

سەرپەرشتیار پرسی:

چەند ساڵی؟

لەبەر ئەوەی زۆر گێژ بوو بووم و ئاگام لە پرسیارەکەی نەبوو و هەرچی بیرو هۆشم هەبوو بە لای پرسیارەکانی مامۆستای لەمەڕ خۆمانەوە بوو وەڵامم دایەوە:

((1492 ساڵ قوربان)).

سەرپەرشتیار لە سەرسامیا هەردوو چاوی زەق کردنەوە و گوتی:

– ئەوە دەڵێی چی؟. پرسیم چەند ساڵی؟

هەرچی دەنگم هەبوو لە گەرووی خۆمدا کۆکردەوە و هاوارم کرد: 1942 ساڵ!. قوتابییەکان مرقەیەکیان لێوە هات و سەرپەرشتیاریش خۆی بۆ نەگیراو بزەیەکی کرد! وامزانی کە وەڵامەکەم بەڕاستی داوەتەوە!. تۆزێك هاتمەوە سەر خۆم. سەرپەرشتیار دووبارە ڕووی پرسیاری تێکردمەوە:

کێ ئەستەمبۆڵی گرت؟

من هەر لە بنەڕەتدا ئاگام لە پرسیارەکەی ئەو نەبوو و هەر خەریکی ئەو وەڵامانە بووم کە یەك بە دوای یەکدا لەبەرم کردبوون. گوتم: ((باوکم!))



ئەمجارەیان منداڵەکان دایانە قاقای پێکەنین، بەڵام سەرپەرشتیار تووڕە بوو و مستێکی توندی لە مێزەکەداو نەڕاندی: ((کوڕە من دەڵێم کێ ئەستەمبۆڵی گرت؟)).

هێندە گێژ ببووم دیسانەوە تێنەگەیشتم چ هەڵەیەکی گەورە دەکەم و بە دڵنیاییەوە وەڵامم دایەوە:

– قوربان باوکم...

سەرپەرشتیار پرسی: ((ئەم باوکەی تۆ کێیە؟))

دیسانەوە هەر بەو شێوەیەی کە یەك بە دوای یەکدا پرسیارو وەڵامەکانیانم لەبەر کردبوون وەڵامم دایەوە، گوێی گرتم و ڕایکێشا و گوتی: ((ئەوە بۆ خۆشت دەزانی دەڵێی چی؟))

بەڵێ قوربان.

پۆل یەکپارچە بووە پێکەنین، مرقە مرق لە ژێر مێزەکانەوە بەرز بووەوە. تەنیا هەر مامۆستاکەمان بوو چەقوت لێدابا خوێنی لێنەدەهات.

بۆ ئەوەی سەرو بنی کێشەکە ڕاست بکاتەوە هاتە بەردەمی سەرپەرشتیار و گوتی:

– قوربان سەری لێشێواوە. ڕێگا بدەن بەندە پرسیاری لێبکەم.. ئینجا زۆر بە سپایی پرسی:

بابە گیان هۆشی خۆت کۆ کەرەوە. بڵێ بزانم وەستا سینان چ کارێکی گەورەی ئەنجام داوە؟

دیسانەوە هەر بەو گێژییەوە وەڵامم دایەوە:

ئەستەمبۆڵی گرت!

ئەدی کێ مزگەوتی سولەیمانییەی دروستکرد؟.

سولتان محەممەدی فاتیح!.

سەرپەرشتیار زۆر تووڕەبوو و نەڕاندی:

گەلحۆ هەموو کەسێك دەزانێ کە وەستا سولتان محەممەد ئەمەریکای دۆزیەوە!

لەم هەڵەیەی سەرپەرشتیار منداڵەکان لە قاقای پێکەنینیان دا. سەرپەرشتیار کە تێگەیشت خۆشی چ هەڵەیەکی کردووە پێکەنین گرتی.

ویستی هەڵەکەی ڕاست کاتەوە گوتی: مەبەستم ئەوە بوو کە مزگەوتی سولەیمانییە وەستا سولەیمان دروستی کردووە!

ئەمجارەیان هێندەی تر خراپتر، بە تەواوی گەندەی کێشەکە وەدەرکەوت:

منداڵەکان یەکجاری دایانە هاڕژنی پێکەنینێ، سەرپەرشتیار کە ئەمەی زانی زۆر تێکچوو، هاتە تەکمەوە بۆ ئەوەی داخی دڵی خۆی بەمندا ڕێژێ، یەك تەوقاتی مزری لە پشتی ملی دام و گوتی: گەلحۆ تۆ منیشت بە هەڵە برد!. ئەوجا بە پەلە لە پۆلەکە چووە دەرێ. مامۆستا هەروا کە بەلای دیوارەکەوە وەستا بوو تفێکی گەورەی کردە زەوی و گوتی: تف، حەیف بۆ ئەو نانەی کە خواردووتە.

دیار نەبوو لەگەڵ منی بوو لەگەڵ منی نەبوو، یان لەگەڵ سەرپەرشتیاری، یان لەگەڵ خۆی بوو!.

لەو ڕۆژە بە دواوە مامۆستا لێم زویر بووەو ئیتر سوپاس بۆ خوا هەر پرسیاریشم لێناکا، هەروەك بەڵێنت دابوو تۆش نامەی درێژ تر بنووسە و هەرچی لەوێ ڕوو دەدات بۆم بنووسە. چاوەڕێی نامەتم.

**ئاواڵی هاوپۆلت**

**ئەحمەد تاربای**



## *نابێ هەموو شتێك لای منداڵان بگوترێ!*

ئەنقەرە 6ی نۆڤەمبەری 1966

برام ئەحمەد:

لەمەودوا هەمیشە وەکو پێشوو نامەی درێژم بۆ بنووسە. مەترسە لە خوێندنەوەی نامە دوورو درێژەکانت ماندوو نابم. نامەکەتم بە چاوپێداخشاندنێك خوێندەوە، نەك هەر من بەڵکو هەموو ئاوەڵانیش خوێندیانەوە. تاوێکیش پێکەنین. چونکە هەوای ئێرە وردە وردە خەریکە سارد دەبێت ناتوانین لەناو باخچەکەدا یاریبکەین. کاتێ لە قوتابخانە دێمەوە خەریکی وانە و ڕاهێنانەکان دەبم، و دایکیشم لە ئامادەکردنی وانەکانمدا یارمەتیم دەدات!.

خوشکم حەز لە ئیشی ماڵ ناکا. بەتایبەتی لە گەسکدان و هەوڕ و هیربار شوشتنێ هێندە بێزارە هەر مەپرسە! تەنها حەزی لەوەیە بچێتە چێشتخانە (مەتبەخ) و کێك دروستکات، ئەویش چ کێکێك کە لە خۆی زیاتر هیچ کەسێك ناتوانێ بیخوا.

دایکیشم پێیناخۆشە خوشکم بچێتە ناو مەتبەخەوە. هەر خوشکم پێبنێتە مەتبەخەوە ئیدی ئەوە دایکم دەبێ یەك هەفتە بەدوای هەوڕو کەوچك و چەقۆ و کەل و پەلی مەتبەخێدا بگەڕێ و هەر پارچەی لە شوێنێك بدۆزێتەوە.

خوشکم خەریك بوو بدرێت بە پیاوێکی باش. بەڵام مەسەلەکە سەری نەگرت، ئەم ڕۆژانە لە ماڵی ئێمەدا قسەی تەنیا هەر دەربارەی ئەو باسەو ئەو شەکرەیە کە مەتین شکاندی چونکە هەڵوەشانەوەی خوازبێنییەکەی خوشکم بەهۆی تاکە





قسەیەکەوە بوو مەتێن کردی!!! شەوانە ئاوەڵەکانی باوکم کە لە پێشا هاوپۆلی یەکتربوون، یا لە ماڵی ئێمە کۆ دەبنەوە یا ئێمە دەچینە ماڵی ئەوان.

تاوێ (گاڵتەو گەپ) دەکەن و دەربارەی بیرەوەرییەکانی رابووردوویان دەدوێن. لەناو قساندا زیاتر هەر ناوی (زەینەڵ بەگ) دەبرێ. ئەویش هەر لە هاوپۆلەکانی سەردەمی منداڵی باوکمە و ئێستا خاوەنی ئەو کۆمپانیایەیە کە باوکم و ئاوەڵەکانی کاری تێدا دەکەن دایکم هەرگیز حەزی لەو قسانە نییەو هەمیشە دەڵێ:

((ئەوەندەم ناوی ئەو زەینەڵ بەگە بیستووە بێزار بوو وم. باشە ئەوە قسەیەکی دیتان نییە بیکەن؟)) لەبەر دایکم قسەکان دەگۆڕن بەڵام سەرلەنوێ باسەکە گرگر دێتەوە سەر زەینەڵ بەگی.

ئەم زینەڵ بەگە چەند کۆمپانیایەکی خانوو و بەرە دروستکردن و چەندین کارخانەی دیکەی هەن و ڕۆژ بەڕۆژ سەرو سامان و داراییشی هەر زیاد دەکا، واش نەزانی ئەم سامانەی لەسایەی زانین و هۆش و داناییەوە پەیدا کردووە، نا، تا ئێستا خودا لەوەی گەمژەتر دروست نەکردووە، بە هەزار ئەڵڵاو ناڵێ عەلی تا سەرەتایی تەواو کردووە، یەکێ لە هاوپۆلەکانی باوکم دەیگوت: زەینەڵ بەگ دە ساڵ لەمن گەورەترە. کاتێك ئەو لە پۆلی سێهەم بوو من تازە دەچوومە قوتابخانە، من سەرەتاییم تەواوکرد زەینەڵ بەگ تازە گەیشتبووە پۆلی چوارەم ئێمە بە گاڵتەوە پێمان دەگوت ((تۆ دەبییە بەڕێوەبەری قوتابخانە)) چونکە هێندە لە قوتابخانەی سەرەتایی مابۆوە سمێڵی بەتەواوی بۆر کردبوو!. ڕۆژێك کە سەرپەرشتیار هاتبووە قوتابخانە مامۆستای بە قوتابی و زەینەڵی بە مامۆستا زانیبوو و بە مامۆستاکەی گووتبوو:

((کوڕە لە جێی خۆت دانیشە))

جا وەرە بزانە چ منداڵێکی کەتەو زەبەللاحە.



باوکم گوتی: پێتان وایە ئێستا لە جاران چاکترە؟. خراپتر بووە چاکتر نەبووە مەگەر نەتان بیستووە پاشەملە چی بەم زەینەڵ بەگە دەڵێن. خەڵك ناویان لێناوە خۆش باوەڕی سەدە. و دەڵێن پاڵەوانی کەریەتییەو تای نییە دە دنیایەدا. یەکێك لە ئاواڵەکانی باوکم بەسەربادانێوە گوتی:

باوکی زەینەڵ بەگ هەمیشە بەدەستییەوە هاواری بوو، و دەیگوت تۆ نابی بە پیاو... ئیستاش کە دەرس و دەورەکەت ناکەی هەر نەبێ وەرە لای خۆم لەناو بازاڕی بەڵکو هەر نەبێ لەبازرگانی و کڕین و فرۆشتنێدا سەرێ دەرکەی.

ئەوەبوو زەینەڵ کەوتە دوای بازرگانی و ئیشەکەی گرتی و بەزوویی بووە خاوەن پارە. یەکێکی دی لە ئاواڵەکانی باوکم گوتی:

ڕاستە پیاوێکی تەوەزەل و کەودەن بوو، بەڵام ئەو هونەرە گەورەیەشی هەبوو کە دەیتوانی کاروبار باش هەڵسوڕێنێ، هەمیشە لە کارگەو کۆمانیاکانیدا ژمارەیەکی زۆر وەستاو ئەندازیارو پارێزەرو پزیشك کاریان دەکرد.

باوکم بە سەغڵتییەوە قسەی ئاواڵەکەی بڕی:

دیارە ئەو ڕێی ڕاستی گرتووە نەك ئێمە. لاسارو کەودەن ئێمە بووین کە خۆشترین ساڵەکانی تەمەنمان لە قوتابخانەدا بەسەر برد.

لەپڕ دوو لە ئاواڵەکانی باوکم هێرشیان بۆ هێنا:

((نەخێر هیچ وانییە)).

((تەنیا پارە بەس نییە بۆ خۆشبەختی)).

باوکم بە ئاماژەی دەست بێدەنگی کردن و گوتی:

ئەوە دەڵێن چی؟ ئەی ئەوە نییە چەند مانگێکە دوای ئەو هەموو خوێندنە، تازە هاتووینە ژێر دەستی ئەو و ئیش دەکەین و چاومان لە دەستی وییەوەیە؟

دایکم کە دیتی قسە خەریکە دەگاتە باریکییە سەر لەنوێ هەڵیدایەوە:

ئەرێ ئەوە ناتانەوێ دەست لە یەخەی زەینەڵ بەگ بکەنەوە؟

هەموو دەیانویست وازبێنن، بەڵام بەدەست خۆیان نەبوو... هەر کاتێ لێك خڕ دەبوونەوە دوای چەند ڕستەیەك دامێنی قسە سەری بۆ لای زەینەڵ و تەمبەڵی و بەخت و ناوچاوانی باشییەوە شۆڕ دەبۆوە.

شەوێك لەماڵی ئێمە دیسانەوە قسە هاتەوە سەر کردار و گەوجییەکانی زەینەڵ بەگی. مەتین وە قسە هات و گوتی:

ئەرێ پێم ناڵێن زەینەڵ بەگ بەو هەموو نەزانییەوە چۆن بۆتە خاوەنی ئەم هەموو سامانە؟

دایکی وەڵامی دایەوە: کاتێ گەورە قسان دەکەن، منداڵ نابێ هەڵدەنێ... بەو قسەیە مەتینی بێدەنگ کرد. باوکم پێی گوت: کوڕم تۆ هێشتا منداڵی سەر لەمە دەرناکەی.

خوشکەکەشم ناوی کوڕی ئەو کاك زەینەڵەی لێهاتبوو. ڕاستی نەشبڕابۆوە، تەنیا هەروا قسەیەکیان لێکردبوو. تۆ خوشکە گەورەکەمت دیوە؟ ئەو هیچ بەمن ناچێ. تا بڵێی جوانە. لەماڵەوەش دەربارەی مەسەلەی دەزگیرانی ئەو هیچیان بە ئێمە نەگوتبوو، خۆشی هەر قسەی نەکردبوو. بەڵام لەو چرپە چرپەی لەماڵەوە دەیانکرد شتێك تێگەیشتبووین. یەکەم کەس کە هەستی بەوە کرد مەتین بوو ئەویش لەو کەیف و مزێجەی دایکمەوە لەوەی کە خوشکم ڕۆژ بەڕۆژ جوانتر دەبوو بەوانە بە باشی تێدەگەیشت کە باس و خواسێك هەیە.

ڕۆژێك مەتین پێی گوتم: دەزانی چ باسە؟ دادەم خەریکی شووکردنە.

– زۆر چاکە جا چییە؟.

من خۆم لێ گێل کردو پرسیم:



– بە کێ؟

– کوڕی زەینەڵ بەگ.

وەڵامم نەدایەوە، ڕاستی نەمدەزانی چ بکەم. مەتین تووڕە بوو و گوتی:

– ئەوە گوێت لێنەبوو؟. پێم گوتی دراوە بە کوڕی زەینەڵ بەگی

– باشە، چی تێدایە تا وا سەغڵەت بیت؟

مەتین زەردەخەنەیەکی تەوساوی بەلای مندا کردو گوتی:

– ها؟ تێگەیشتم دیارە تۆش لەوانی؟

– ئەمە ئیشی ئێمە نییە

دوای ئەوە چەند جارێکی دیش ئەم باسە لەنێوان من و مەتیندا هاتەوە گۆڕێ. ئەو قسەکانی منی پێخۆش نەبوون. دەیپرسی:

– بۆ پەیوەندی بە ئێمەوە نییە؟. من نامەوێ خوشکم شوو بە کوڕی کەسێك بکا کە هەرگیز نەیخوێندووە و ژیانی بە تەمبەڵی بەسەر بردووە.

– باوکی گەمژە بووە کوڕەکەی چی بکات؟

– جا بۆ پێتوایە کوڕەکەی چۆنە؟ ئەویش هەروەك باوکیەتی. نەتبیستووە گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە؟ ئەمیش نەیتوانیوە بەڕەنجی شانی خۆی قوتابخانە تەواو بکات بەڵکو بەزۆری پارەو واسیتە سانەوی تەواو کردووە.

گوتم:

– مەتین گیان، ئەگەر دایکم گوێی لەم قسانەی تۆ بێ تووڕە دەبێ. دیارە گەورەکان بیری هەموو شتێکیان کردۆتەوە.

مەتین ئەمجارەیان بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

– دەزانم تۆش هەر لای ئەوانی. بەڵام من لە دەست گەورەکان بێزارم، و ناهێڵم ئەم کارە سەربگرێ.

– بۆ؟.

– بۆی ناوێ، باوکم و ئاواڵەکانی پاشەملە ئەو هەمووە خەریکی باسی خراپەی زەینەڵ بەگن، کەچی دەشیانەوێ خوشکم بدەن بە کوڕەکەی باشە ئەمە چەندی بە چەندییە؟. هەستاو ڕۆیشت. نەیویست چاوی بە فرمێسکەوە ببینم. لەو ڕۆژە بەدواوە مەتین کە منداڵێکی شەرمن و گوێڕایەڵ بوو، بوو بە منداڵێکی چەقاوەسوو و لاسار، لە قوتابخانە ڕایدەکرد. زوو زوو سکاڵای مامۆستاو بەڕێوەبەر دەگەیشت کە ناخوێنێ.

باوکم زۆر تەنگەتاو بوو. دەستیکرد بە ئامۆژگاری کردنی. سوودێکی نەبوو. لێیدا، ئەنجامی نەبوو. دیسانەوە لە قوتابخانە هەر ڕایدەکردەوە، بەیانیان دایکم دەیبردە قوتابخانە، بەڵام لەپۆلدا هەر گیر نەدەبوو.

هەر کاتێ کە باوکم دەیویست بە خۆشی بیدوێنێ ئەم نێوچەوانی تێك دەناو وەڵامی یەك وشەشی نەدەدایەوە. ڕۆژێك ویستم دەردەکەی تێبگەم کەوتمە دواندنی:

بەدەنگێکی نێرانەوە گوتی:

تۆ سەرت لەم ئیشانە دەرناچێ بەخۆڕاییش قسە مەکە.

دوای ئەمە ئیدی خۆشی و شادی لەماڵی ئێمە هەڵگیرا.

دایکم لەماڵەوە دەگریا. باوکم هەمیشە ڕووی گرژ بوو. خوشکیشم ئیدی دەستی بەخۆیدا نەدەهێناو پێنەدەکەنی.



شەوێك سەیرمان کرد ئەوە هەوا تاریك داهات بەڵام مەتین هەر نەهاتەوە ماڵێ. هەموو ڕژاینە کۆڵانێ و بە دوای ئەودا کەوتینە گەڕان. هەر شوێنێك گومانمان لێکرد چووین. بەڵام ئەو بوو بە تیکە نانێك و قووت درا.

گەڕاینەوە ماڵێ، ئاواڵەکانی باوکیشم هاتن و ماڵەکەمان بوو بە پرسە. دایکم پرچی خۆی دەڕنیەوەو باوکیشم دەگریا. ئاواڵەکانی باوکم هەر لە مقۆ مقۆ دابوون. لەپڕ زەنگی دەرگا لێدرا. هەموو بە کۆمەڵ ڕامانکردە بەر دەرگا، مەتین بێ ترس و لەرز هاتە ژوورەوە. باوکیشم نەیپرسی ((لەکوێ بووی؟)) پاش تاوێك باوکم مەتینی بانگ کردو لەسەرەخۆ دەستی بە قسان کرد:

کوڕی خۆم ئەوەی نەچێتە قوتابخانەو نەخوێنێ نابێتە پیاو. پیاو چەند ئیش بکات هێندەی سوود پێدەگات. دوا ڕۆژی تۆ بەوەوە بەندە کە ئیمڕۆ بخوێنی و ماندوو بیت.

ئاواڵەکانی باوکیشم هەریەکەو لە ئاشێکیان لێدەکرد:

((کوڕەکەم هەر کەسێ لە ژیاندا زۆرتر ئیش بکات، لە گەورەییدا لە هانای دێ))

((لە منداڵیدا پێویستە زۆرتر ئیش بکەین، تا لە گەورەییدا بحەسێینەوە)).

مەتین کە ماوەیەك بوو سەری بەردابۆوە و گوێی شل کردبوون، ئارامی لێهەڵگیرا، لەپڕ سەری بەرز کردەوەو گوتی:

– ئەو کەسەی ئیش دەکات چەندی دەست دەکەوێ؟

– بە چۆنیەتی ئیش کردنەکەوە بەندە. هەر چەندە زۆر ئیش بکەیت زۆرترت پێدەگات.

– زەینەڵ بەگ زۆری ئیش کردووە کە ئەم هەمووەی دەستکەوێ؟.

لەبەرامبەر ئەم پرسیارەی مەتیندا هەموو بێدەنگ بوون نەیاندەزانی چ وەڵامێکی ئەم منداڵە بدەنەوە باوکم زانی گیری خواردووە دەنگی نزمتر کردەوەو گوتی:

ئێمەش کاتێ منداڵ بووین، سەروەختی منداڵیمان ڕابوورد، بەڵام کاتێ کە منداڵ بووین... مەتین قسەکەی باوکمی بڕی و گوتی:

– ئەو کەسەی ئیش نەکات قازانجی زیاترە.

ئەمجارەیان باوکم تووڕە بوو و دەنگی لێ هەڵبڕی:

– کەواتە باوکت درۆ دەکات؟

مەتین لە پڕمەی گریانێیدا و بە دەم گریانێوە گوتی:

– ئێوە ڕاست دەکەن، منیش هەر لە خۆتانم بیستووە، ئەی ئەوە نییە ئێوە هەموو شەوێ دەربارەی کەودەنی و نەزانیی زەینەڵ بەگ دەدوان و دەدوێن؟

ئێستاش ئەو لە کارخانە گەورەی هەمووتانە. چەند کارخانەی هەیە، هاوبەشی چەند کۆمپانیای دیکەیە... ئۆتۆمبێل... خانوو و بەرە... پارەی زۆر. بەڵام ئێوە چی؟ هەمووتان نانخۆری ئەون. کوڕەکەشی نەیخوێندووەو وەکو باوکی گەمژەو گەلحۆیە، بەڵام...

مەتین نەختێك ڕاوەستا. فرمێسکەکانی سڕینەوەو بە دەنگێکی دلێرەوە درێژەی دایە:

– من ئیدی ناچمە قوتابخانە. منیش دەمەوێ لە زەینەڵ بەگ دەوڵەمەندتر بم و وەکو ئەو سەدان پزیشك و ئەندازیارو کرێکار لەژێر دەستمدا ئیشبکەن. و ئیش بدەم بەو کەسانەی کە هەست و تێگەیشتن و خوێندەواریان زۆرە!.

مەتین چووە ژووری نوستنێ. لەوێش هەر بۆڵە بۆڵی بوو، باوکم کە زۆر پەست بوو ڕووی دەمی لە مەتینی کرد:



– زۆر باشە کوڕی خۆم. چۆنت دڵ دێنێ وا بکە... ئەگەر ناشتەوێ بچیە قوتابخانە مەچۆ. دوایی ڕووی کردە ئاواڵەکانی و گوتی:

– گوناهی ئێمەیە. نەدەبوو لای منداڵان هەموو شتێك بگوترێ و هەموو قسەیەکیش کرابایە. ژنی یەکێك لە ئاواڵەکانی باوکم پەنجەی بۆ لای من کێشاو گوتی:

– بەڵێ دەبێ زۆر وریای منداڵ بی.

یەکێك لە ئاواڵەکانی باوکم گوتی:

– بەلای منەوە مەتین هەقیەتی. ئێمە کە هێندەمان خوێند بووین بەچی؟ هاتووینە لای زەینەڵ بەگ و لەژێر دەستی ویدا کار دەکەین.

دایکم و باوکم لە مەبەستی مەتین گەیشتن و زانیان هەموو ئەو قسانەی کە کردی لە خوازبێنی کچەکەیانەوە بۆ کوڕی زەینەڵ بەگەوە سەرچاوەی گرتووە.

دوای چەند ڕۆژێك لەو گفتە پەشیمان بوونەوە و ئیشێکی باشیان لەدایەرەیەك بۆ خوشکم پەیدا کرد. ئێستا خوشکم ئیش دەکات. هەر دەست بە دوعایە بۆ مەتین کە لەو چارەنووسە ڕەشە ڕزگاری کرد. دیارە بیستووتانە کە دەڵێن ((خراپ هەرگیز چاك نابێت چونکە بناغەکەی لەسەر خراپەوە هاتووە)).

– لەم دنیایەدا هەر تەنیا پارە بۆ خۆشگوزەرانی و بەختەوەرییە بەس نییە تا یەکێك ببێتە پیاو و خۆشبەخت و بەختیار بێت.

مەتینیش کە قسەکەی سەری گرت، لە بەیانی ئەو شەوەوە چۆوە قوتابخانەو لە جارانیش چاکتر بوو. ئیدی نەهارو هاجی دەکات و نە نارەحەتی و هەمیشەی خودای هەر بسکەی سمێڵانی دێ. لە ماڵێ دەگەڵ هەمووواندا ئاشت بۆوە، دەگەڵەمندا نەبێ کە هێشتا نازانم بۆ لێم زیزە. من هیچ لەخۆمدا شك نابەم ئەوە نەبێ بەلای ئەومدا دانەشکاندووە.

بەڵام من ئەوم لە جاران خۆشتر دەوێ. مەتین بەو ڕەفتارەی کەسایەتییە خۆی نواندو هەمووی تەمبێ کردن. گومان ناکەم زیزییەکەشی لەگەڵ مندا هێندە درێژە بکێشێ.

ئەم نامەیەم دوای نانخواردنی ئێوارە نووسی، ئێستا خەوم دێ و دەمەوێ بنووم. بەیانی قوتابخانە نییە، دایکم گفتی داوە سەر لە بەیانییەکەی من و مەتین بەرێتەشانۆگەرییەکی منداڵان. سڵاو بە هەموو ئاواڵەکانی قوتابخانە بگەیەنە، ئەگەر بە کۆمەڵ وێنەتان گرتووە بۆم بنێرە، دڵم تینووی دیداری هەمووتانە.

**داواکاری سەرکەوتنتم و چاوەڕێی وەڵامتم**

**ئاوەڵی خۆت**

**زەینەب یالکەر**



## منداڵی فیداکار

ئەستەمبۆڵ 12ی نۆڤەمبەری 1966

خوشکی خۆشەویستم زەینەب:

دوو ڕۆژە نامەکەتم پێگەیشتووە. تا ئێستا نەمتوانیوە وەڵامت بدەمەوە، چونکە مامۆستاکەمان هێندەی ئەرك بەسەردا داوین دەستمان ناگات سەری خۆمان بخورێنین. خۆشەویستییە مامۆستای تازە ڕۆژ بەرۆژ زیاتر لە دڵما دەچەسپێ.

لەبیرتە کە نووسیبووم کە بەرێوەبەر هاتە ناو پۆل و دەمیر چ شەکرێکی شکاند؟

دوای ئەمە هەموو وامانزانی، کە مامۆستا ڕق لە دەمیر هەڵدەگرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە نەك تەنیا هەر لە دڵی نەگرتبوو بەڵکو زۆر پیاوانەشمان بە دەنگەوە هات و زۆر جار چیرۆکمان لەبارەی فیداکارییەوە بۆ دەگێڕێتەوەو دوایی ڕووی پرسیارمان تێدەکا:

((لەم داستانە چ تێگەیشتن؟ سەرەنجامێکتان دەست کەوت؟ چ دەرسێکتان لێوەرگرت؟.)) دەزانی مامۆستاکەمان بۆ هێندەی نێوان دەگەڵ مندا خۆشە؟ چونکە لەهەمووان زووتر دەگەمە سەرەنجامی ئەو چیرۆکانەی کە بۆمان دەگێڕێتەوەو هەموو جارێکیش ئافەرینێکم لێدەکات.

دوایی ڕوو دەکاتە منداڵەکان:

((پێویستە ئێوەش وەکو ئەو منداڵەی ناو چیرۆکەکەی بۆم گێڕانەوە لەخۆبوردەو فیداکار بن)). منداڵەکان وردە وردە لەم چیرۆکانە وەڕەز بوون،





بەتایبەتی کە ناچارن مەبەستەکانیان دەربێنن، هەر لەبەر ئەمە دوێنێ چیرۆکێکی گێڕایەوەو من بە ئارەزووی خۆم و بێ پەلەکردن مەبەستەکەیم ڕوون کردەوە، داستانەکەش بەم جۆرەیە:

((منداڵێکی لادێی لەکاتی شەڕدا قوتابی سەرەتایی دەبێ، بۆ ئەوەی ئاگاداری جموجۆڵی سەربازانی دوژمن بێت، دەچێتە سەر دار سنەوبەرێك و خۆی مات دەدا، هەرکە لە دوورەوە دوژمنی بەرچاو دەکەوێ بە ئەسپایی دەخزێتەوە خوارێ و بە زوویی سەربازەکانی خۆیان ئاگادار دەکاتەوە، بەڵام وا ڕێك دەکەوێ گوللەیەکی دوژمنی بەردەکەوێت و بریندار دەبێت، بەو حاڵەشەوە هەر خۆی دەگەیەنێتە سەر فەرماندەو دوای ئەوەی هەواڵەکەی بۆ باس دەکا لە باوەشی سەرفەرماندەدا گیانی دەسپێرێ)).

مامۆستا دوای گێڕانەوەی چیرۆکەکە گوتی:

– باشە ئەحمەد پێم بڵێ چ مەبەستێکمان لەم داستانە دەست دەکەوێ؟

لەجێی خۆمەوە هەستام و وەڵامم دایەوە:

مامۆستا ئەم چیرۆکەی گێڕاتانەوە ڕاستە؟. یا گەورەکان دایانناوە تا منداڵان فێری فیداکاری بکەن؟ مامۆستا لەم پرسیارەی من واقی وڕما، چونکە چاوەڕوانی ئەم جۆرە پرسیارانە نەبوو لێم، هەڵوەستەیەکی کردو گوتی:

– مەبەستت چییە، ڕاست بێ یان هەڵبەستراو چ جیاوازییەکی تێدایە؟

– ئەگەر ڕاستیش بێت باوەڕکردنی زۆر گرانە.

– بۆچی؟

– پیاو نەمابوو ئەم ئیشە گرنگە ئەنجامبدات، منداڵێکی دە دوازدە ساڵان نەبێ؟ من وای تێدەگەم ئەم چیرۆکە ڕاست نەبێ! و...

مامۆستا قسەکەی منی بڕی و لە منداڵەکانی پرسی:



– ئێوەش هەمووتان وەکو ئەحمەدی بۆ دەچن؟.

ئەم پرسیارە غەڵبە غەڵبێکی زۆری دروستکرد لە ژوورەکەدا.

((نا نەخێر، نە. مامۆستا. نەخێر))

تەنیا دەمیر لە جێگای خۆی ڕاپەڕی و گوتی:

– منیش وەکو ئەحمەدی بۆ دەچم.

مامۆستا زۆر تووڕە بوو و ڕووی کردە منداڵەکان:

– بەڕای ئێوە ئەحمەدو دەمیر بۆچی بەپێچەوانەی ئێوەوە بیر دەکەنەوە؟

جەنگیز هەستا سەر پێ و وەڵامی دایەوە:

– هەر بۆ ئەوەی خۆیان لە ئێمە هەڵاوێرن، هەمیشە بەپێچەوانەی ئێمەوە وەڵام دەدەنەوە.

زەنگی دەرەوە لێدرا، مامۆستا گوتی:

دوای نیوەڕۆ جارێکی دیش لەم باسە دەدوێینەوە.

– زەینەب گیان زۆرم پێخۆش بوو زەنگی دەرەوەی لێدا، چونکە لە دەرەوە دەمتوانی ئەو قسانەی دە دڵمدا بوون بەئاسانی بە مامۆستایان بڵێم.

جەنگیز بەلامدا تێدەپەڕی گوتی:

کاکی ((دانا)) چۆنی؟

سەلمانیش کە بە تەنیشت ئەوەوە بوو هەڵیدایەوە:

ئەگەر هێندە نەزەڕی نابێ؟

لە ڕاستیدا من هەموو کاتێك بلیمەتییە خۆمم بە ڕووی ئەواندا دەسوو. بەڵام ئەم داستانەم بەدڵ نەبوو.





بەپێچەوانەوە منداڵەکان چیرۆکەکەی مامۆستا کاری تێکردبوون.

لەکاتی پشووی دەرەوەدا زۆربەی منداڵەکان چووبوونەسەر درەختەکانی ناوەڕاستی حەساری قوتابخانە و خۆیان کردبوو بە قەڵاوێز.

هەندێکیشیان بەدەم، لاسایی دەنگی شەستتیریان دەکردەوە. ((تاڕڕ.. تاڕڕ.. دڕڕڕ)). لەبەر ئەوە حەسارەکە درەختی کەم تێدا بوو و جێی هەموو منداڵەکان نەدەبۆوە، من بە پەنجەرەی ژووری خوارەوەدا چوومە سەر دیواری و لەوێ لە پشت لوولە پلوسکێکەوە خۆم دانووساند!

جەنگیز و حوسێن لە سەردارێك شەڕیان بوو. حوسێن دەیگوت:

((دەبێ من قەڵاوێزبم))

جەنگیزیش دەیگوت: ((نەخێر دەبێ من بم، ئەم فەرمانەیان بە من ئەسپاردووە!)) لە دواییشدا جەنگیز حوسێنی لەسەر درەختەکەوە بەردایەوە خوارێ.

حوسێن لەژێر درەختەکەوە هاواری لێ هەستا، هەموومان بەرەو لای ئەوەوە ڕامانکردو مامۆستاکانیش گەیشتنە سەری، مامۆستای پۆلی دووەم لە حوسێنی پرسی:

– پێم نالێی تۆ لەسەر ئەو دارە چت دەکرد؟

– خەریکی پاسەوانییە بووم و ئاگاداری جمجۆڵی دوژمنم دەکرد!.

مامۆستا بەم وەڵامەی زیاتر واق وڕما:

– کام دوژمن؟ بۆ ئێرە گۆڕەپان و بەرەی شەڕێیە؟

برینەکانی حوسێن هێندە نەبوون. سەریان پێچاو برینەکانی دەست و قاچیشیان تیمار کرد، جەنگیز کە حوسێنی بەردابۆوە، هەر لەسەر دارەکەبوو و وەکو بی ناو ئاوێ دەلەرزی.



مامۆستا لە حوسێنی پرسی:

کێ پاڵی پێوەنای؟

– کەس پاڵی پێوە نەنام، قاچم هەڵخلیسکاو بەربوومەوە.

ئەم وەزعەی حوسێن خستمیە سەر بیرو لێکدانەوەو هۆشی پەرت کردم.

بەم جۆرە کە دوای نیوەڕۆ مامۆستا پرسیاری لە قوتابییەکان کردەوە من خۆم بۆ ڕانەگیراو هەستام: فیداکاری ئیشی مرۆڤێکی گەورەیە، تەنیا ئەوانەی گیانیان پاکەو دەروونیان بێ خەوشە دەتوانن ببنە قوربانی کەسانی دی.

مامۆستاکەمان ئەم وەڵامەی منی زۆر پێخۆش بوو و پێشبڕکەیەکیشی لەنێوان قوتابییانی پۆلی پێنجەمی (أ)و پۆلی پێنجەمی (ب)دا ڕێکخست. ئەم پێشبڕکێیە لەناو قوتابخانەدا دەنگی دایەوە. هەر یەکە لە منداڵەکان بەتاسەو کەفوکوڵەوە دەیویست باشترین دارشتن بنووسێ. مامۆستاکەمان زۆری هیوا بە سەرکەوتنی من هەبوو و هەمیشە هانی دەدام کە چیرۆکێکی باش بنووسم!.

سێ شەو و سێ ڕۆژان خەریکی چیرۆکەکەم بووم، لەپێشدا بۆ دایکم و باوکم خویندەوە، باوکم چیرۆکەکەمی پەسەند نەکرد! بۆ مامیشم خوێندەوە ئەویش هەر پەسەندی نەبوو.

کورتەی چیرۆکەکەم بەم جۆرەیە:

((منداڵێك برایەکەی زۆر نەخۆش دەبێت، هەموو ئەندامانی خێزانەکەی نیگەران دەبن، منداڵەکە کە گیانێکی پاك و سادەو بێ خەوشی دەبێ هەموو شەوێ نزای بۆ برا نەخۆشەکەی دەکرد: (خودایە براکەم نەکوژی، من بکوژە لەجیاتی ئەو)، شەوێکیان دێوێکی گەورەی زەبەللاحی دێتە خەونێ و بە دەنگە ناسازەکەی دەڵێ:

((نزایەکەت گیرابووە، ئەوا هاتووم تۆ لە جیاتی براکەت بەرم)).





منداڵەکە دەست دەکات بەگریان و بە پاڕانەوەوە وەڵام دەداتەوە:

((ناماقوڵیم کرد: من ئەمەم هەر تەنیا بۆ ناوێ کردووەو گوتووە!))

دەنگی هێندە بەرز دەبێتەوە دایکی لەخەو ڕادەپەڕێ و دەپرسێ:

((ئازیزەکەم ئەوە خەونت دەدیت؟ لێفەکەت لەسەر لاچووەو سەرمات بووە بۆیە دەتبزڕکاند!)) بەم چەند وشانە دایکی منداڵەکەی هێور دەکاتەوە.

ڕۆژی پێشبڕکەکە هەموو قوتابییانی پۆلی چوارەم و پێنجەم لەهۆڵەکەدا ئامادەبوون. مامۆستکانیش هاتبوون، لەپۆلەکەی ئێمە شەش کەس و لە پۆلی پێنجەمی (ب)ش پێنج کەس هاوبەشی ئەم پێشبڕکەیەیان کردبوو. کاتێ سەرەی من هات و چیرۆکەکەم خوێندەوە قواتبییەکان هەموو پێکەنین و کەوتنە چەپڵە لێدان، بەڵام لەڕەنگ و ڕووی مامۆستاکان واتێگەیشتم کە ئەوانیش بەلایانەوە خۆش نەبوو بێ، بۆ دەستنیشان کردنی سەرکەوتووەکان مامۆستاکان چوونەوە ژووری خۆیان و قوتابییەکانیش لەهۆڵەکەدا مانەوە.

خۆ بۆ خۆت هارو هاجییەی منداڵانت دیوە؟ هەر ئەوەندە مامۆستاکان لە هۆڵەکە چوونە دەرێ هەراو هۆریا و گاڵتەو گەمەیان دنیای پڕ کرد!

ئەم ڕۆژانە لە قوتابخانەدا هەر منداڵەی تیرو کەوانێکی بەدەستەوەیە، کاغەزێکی لوول پێچ بەلاستیکێکی باریکەوە دەبەستن و دەیهاوێن. ئەم گوللە کاغەزانە هێندە بە ئازارن، زیڕە لەپیاو هەڵدەستێنن! من دەستم ڕاست نییە، تەنانەت ناتوانم بەردێکیش دوو مەتران هەڵدەم! منداڵەکان هەمیشە گاڵتەم پێدەکەن و دەڵێن ((ئەحمەد وەکو کچان بەردی داوێ)).

ئەو ڕۆژە کە لە ناو هەڵەکەدا دانیشتبووین و چاوەڕوانی ئاشکرا کردنی سەرەنجامی پێشبڕکەکە بووین، لەپڕ وەك دەرزیم لە پشتە ملی ڕاکەن ڕاچلەکیم، ئاوڕم دایەوە لە پێکەنینی منداڵەکانەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم چزەیە هی



تیروکەوانێ بوو، لەتاوان پڕمدایە تیروکەوانی ئاوەڵەکەی تەنیشتم و فیشەکێکم تێهاویشت و بەڕێم کرد.

ئاخ زەینەب پیاو خوا بۆی نەهێنی ئەوها دەبێ، هەر لەوکاتەدا بەڕێوەبەرو چاودێرو مامۆستاکان هاتنە هۆڵەکەوە فیشەکی ماڵوێران یەکراست بە ملی بەڕێوەبەرەوە نووسا!. بەڕێوەبەر دەستی بەملیەوە گرت و چاوێکی تووڕەیی بە منداڵەکاندا خشاند!.

مامۆستاکەمان پرسی:

– کێ ئەمەی هاویشت؟ هەر کەسێ بوو با بۆ خۆی هەستێ.

من سەرم داخستبوو و نەمدەویست هەستم، دووبارە گوتی:

ئەگەر ئەوەی هاویشتی هەڵنەستێ هەمووتان سزا دەدەم، نیوەڕۆیەشتان لێرە بەند دەکەم. باسی پێشبڕکەو سەرکەوتووان لەبیر چۆوە، من هەستام و گوتم:

– من هاوێشتم قوربان.

بەڕێوەبەر سەیرێکی کردم و گوتی:

– تۆ نەبووی.

– من هاوێشتم.

بەڕێوەبەر دیسانەوە هەر باوەڕی نەکرد:

– من تەماشای هەر کەسێ بکەم دەزانم گوناهکارە یان نا. تۆ نەبووی. تۆ دەزانی هەموو قوتابییەکان خەریکە سزا بدرێن خۆت کرد بە قوربانی ئەوان ویستت گوناهەکە لەجیاتی ئەوان بخەیتە ملی خۆت.

من کە ئەم جۆرە نیازەم هەر دە دڵیشدا نەبوو. گوتم:

– قوربان خوا دەیزانێ بە ئەنقەست ئەم کارەم نەکرد، ویستم لە یەکێکی دیکەی بگرم لە دەستم دەرچوو و بەر ئێوە کەوت.

بەرێوەبەر ڕووی کردە قوتابییەکان و گوتی:

– سەیرکەن ئەمەیە فیداکاری، ئەم ئاواڵەی ئێوە نموونەی فیداکاری پێشان دا. هەرچەندە ئەویش تیرەکەی نەهاویشتووە، بەڵام بۆ ڕزگارکردنی هەمووان گوناهەکەی خستە ملی خۆی. بەمە دەڵێن مرۆڤێکی تەواو!!!.

با ئەم پێشهاتە بۆ هەمووتان ببێتە سەرمەشق. لەبەر ئەمە هەمووتان بەو دەبەخشم.

لەدواییدا ڕووی لەمن کردو گوتی:

– چیرۆکەکەی نوسیبووت زۆر باش نییە، بەڵام بەهۆی ئەم کارەوە کە کردت نمرەی یەکەمیت دەدەمێ دەبینی؟ هیچ شتێك وەکو خۆی نەماوەو لەجێی خۆیدا نییە تەنانەت فیداکاریش لەم دەورو زەمانەی ئێمەدا ماناکەی گۆڕاوە.

خۆزگە زوو ئەم پلەی سەرەتاییەم تەواو دەکرد.

باوکم چونکە بۆخۆی نەیخوێندووە زۆری پێخۆشبوو من خوێندن تەواوکەم، دوای قوتابخانەی سانەویش دەیەویست بمنێرێتە زانکۆ. دواییش نیازی وایە بمنێرێتە دەرەوە بۆ خوێندن. لە ئێستاوە لەگەڵ دایکمدا چەقە چەقمانە. ئەو بەو ڕۆیشتنەی دەرەوەم قایل نییە و دەڵێ ((من تاوی جیابوونەوەو دووری تۆم نییە)) نازانم داخوا دایك و باوکی تۆش وان؟

سەرکەوتنت لەخوای گەورە دەخوازم. سڵاو بە تێکڕای قوتابییەکان بگەیەنە.

**چاوەڕوانی وەڵامم**

**ئەحمەد تاباری**



## ئەمەم لەتۆ ڕانەدەدیت

ئەستەمبۆڵ 20ی نۆڤەمبەری 1966

ئاوەڵی خۆشەویستم ئەحمەد:

سوپاس کە بەرێکو پێکی نامەم بۆ دەنووسی. کاتی خوێندنەوەی نامەکەت ئەوەم بە بیرداهات، ئاخۆ بەڕاستی ئەم ڕووداوانەت بەسەرهاتووە یا هەر لەخۆتەوە دروستیان دەکەی؟

نامەکانتم هێندە پێخۆشن هەر مەپرسە، خۆزگە منیش دەمتوانی وەکو تۆ بنووسم، بەرێکەوت چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لە قوتابخانەکەی ئێمەشدا شتێك ڕوویدا کە تەنیا مامۆستاکەمان نەبێ کە زۆر توورە بوو دەنا هەموو قوتابییەکان هێندەیان نەمابوو بپسێن لە پێکەنینێ.

واتێنەگەی ئەم چیرۆکەم هەروا لەخۆوە بۆ پێکەنینێ دروستکردبێ تا نامەکەمی پێ سەرنج ڕاکێش کەم. نا، بەگیانی تۆ باسەکە چۆن ڕوویداوە ئاوات بۆ دەگێڕمەوە.

دەبێ لە پێشەوە پاڵەوانی باسەکەت پێ بناسێنم.

هەڤاڵێکمان هەیە ناوی ((عوسمان))ە، یەکێکە لە قوتابییانی پۆلەکە، بە تایبەتی لە خوێندندا زۆر چاکە. منداڵێکی ڕێکوپێکیشە. کتێب و دەفتەرو سیپارەی هەمیشە پاك و خاوێن و تەمیزن، نووکی قەڵەمەکەی هەمیشە تیژو ئامادەیە. بە پێچەوانەی منەوە، کە هیچ کاتێ قەڵەمی تەواویشم پێ نییە!! عوسمان خەتیشی زۆر خۆشە، زۆر جار مامۆستا دەفتەری ڕاهێنانەکەی لە پۆلدا بە منداڵەکان پێشان دەداو دەڵێ:





((بەم جۆرە بنووسن.. ئێ!)) ئێمەش دەمانەویست بەو جۆرە بنووسین بەڵام هیچ کامێکمان نەماندەتوانی و نوسینەکانمان لێ تێکەڵ و پێکەڵ دەبوو!!!

ماموٚستای ئێوەش ئەم فەرمانەتان دەداتێ؟ ئێمە ئیتر لە فەرمانەکانی ماموٚستاکەمان وە تەنگ هاتووین، هەموو ڕۆژێ کۆڵێك ئەرکی ماڵەوەمان دەداتێ، کە دەبێ لەماڵەوە بیکەین، ئەو دەیەوێ کارێ بکات کە ئێمە شەوانیش هەر سەرقاڵ بین. ڕۆژێ عوسمان گوتی:

– منداڵینە ماموٚستا ئەرك و نوسینەوەکانی ئێمە ناخوێنێتەوە، تەنیا هەر چاوێکیان پێدا دەخشێنێ.

من وەڵامم دایەوە:

– ئەگەر نایخوێنێتەوە ئەی بۆ ئەرکی ماڵەوەمان هێندە دەداتێ؟

عوسمان هەر لەسەر قسەکەی خۆی مایەوە:

– من دڵنیام نایانخوێنێتەوە؟

– تۆ چوزانی نایانخوێنێتەوە؟

یەکێك لە ئاوەڵەکان گوتی:

مەسەلەکە ئاشکرایە!! ژمارەی ئێمە لە پۆلا 48 چل و هەشت کەسە لەگەڵ ئەوەشدا هەر رۆژە نا ڕۆژێك ئەرکمان دەداتێ، کە دەکاتە ڕۆژێ (24) بیست و چوار پەڕە واتا هەفتەی سەدو چل و چوار پەڕە بخوێنێتەوە و چاکیان بکات!!

من پرسیم:

– مەبەستت لەم قسانە چییە؟

– ئێستا بە شتێکی سادەو ئاسان بۆتی دەردەخەم ماموٚستا لە چ سەعاتێکدا بۆی دەکرێ دەست بە خوێندنەوەیان بکات.



یەکێ لە منداڵەکان کە زۆر بێزار بوو گوتی:

– بابە ئەم قسانە چ پەیوەندییەکیان بەسەر ئەوەوەیە، هەر کاتێ ئارەزووی کرد دەستپێدەکات!

– من دەمەوێ قسەکەمتان پێ بسەلمێنم.

یەکێك لە منداڵەکانی دی گوتی:

– وای دادەنێین سەعات هەشت دەستپێدەکات.

یەکێکی دی گوتی:

– بۆ سەعات هەشت؟ با سەعات پێنج بێ.

من گوتم:

– نە بابە. سەعات پێنج و نیو ئەو تازە دەگاتەوە ماڵێ.

عوسمان بە پێکەنینێك بێدەنگی کردین:

باشە کاتێکی مام ناوەندی دەگرین، با بڵێین سەعات حەوت دەستپێدەکات، بەلای ئێوەوە چاك کردنی هەر پەڕەیەك بەلای کەمەوە چەندی کات دەوێ؟ بەلای قوتابییەکانەوە ئەمە لە نێوان سێ دەقیقەوە تا دە دەقیقەی دەویست. لە دواییدا هەموومان لەسەر چوار دەقیقە گیرساینەوە. عوسمان لە مێشکی خۆیدا لێکی دا و دابەشی کردەوە، وەڵامەکەی کردیە شەوێ نۆ سەعات! لە دواییدا ڕووی کردەوە منداڵەکان و گوتی:

– دیتتان ئەگەر هەموو ڕۆژێ سەعات حەوتی ئێوارە دەست پێبکات دەبێ بەبێ ڕاوەستان تا بەیانی ئیش بکات، نە فریای خەو و خواردن و نەهیچ ئیشێکی دی دەکەوێت!

من گوتم:

- ئەوە لەمامۆستای ئێمە بەدوور نییە. لەوانەیە تەواوی ئیشەكانی دیكە واز لێ بێنێ و پەڕەكانی ئێمە سەیركات.

عوسمان پێكەنی:

- نە كاكی خۆم. كەس ئەوەی لە خۆ نەگرتووە بۆ چەند قرۆشێك مووچە خۆی بكوژێ. یەك دوانێكیان لێ دەخوێنێتەوەو ئەوانیدی واژۆ دەكات!

دوای چەند رۆژێك یەكێك لە قوتابییە كچەكانمان گوتی:

- دەڵێی قسەكەی عوسمان خەریكە وە راست...

- چۆنت زانی؟

- یەكێ لە ئاواڵەكانم كە ماڵەكەیان نزیكی ماڵی مامۆستاكەمانە بەیانی كە دێ بۆ قوتابخانە لە كۆڵان چاوی بە كۆمەڵێك پەڕە كاغەزی دڕاو دەكەوێ. یەكێكیان دەناسێتەوە، دادێتەوە، پەڕەكان كۆ دەكاتەوەو دەبینێ هی ئەو تاقیكردنەوەن، كە یەك دوو ڕۆژ لەمەوبەر خۆی نوسیویەتی بەدوای پارچەكانیدا دەڕوا تا دەگاتە بەرمیلی خۆڵەكە كە دەبینێ پەڕە دڕاوەكانی تاقیكردنەوەی تەواوی قوتابییەكان لەوێ ڕۆكراون. ئێستا هێندێكیشی لەو پەڕە دڕاوانەدەگەڵ خۆیدا هێناوە.

گوتم:

- ئەمە نابێتە بەڵگە، لەوانەیە خوێندنییەوەو لەدواییدا فڕێیدابن، ڕاستت دەوێ خۆشم كەمێكم گومان كەوتە دڵیەوە ((لە پۆلا عوسمان لە ڕیزی من دادەنیشێ)). كاتێ مامۆستا گوتی ((دەمەوێ تاقیكردنەوەی مێژووتان بكەم)) عوسمان لەسەرخۆ پێی گوتم:

من ئێستا دەیسەلمێنم، كە مامۆستا پەڕەی تاقیكردنەوەی ڕۆژانەكانمان دەخوێنێتەوە یان نا!



پرسیم:

- چۆن دەیسەلمێنی؟.

- لەجیاتی تاقیكردنەوە نامەیەك دەنووسم.

مامۆستا گوتی:

پەڕەو قەڵەم دەرێنن و خۆتان ئامادە بكەن.

پرسیارێكیان ئەمە بوو ((لەبارەی سوڵتان سلێمان سەلیمەوە چی دەزانن؟.)) هەموو دەستیان كرد بە نووسین، عوسمان، لە دێڕی یەكەمدا چەند جارێك ناوی سوڵتان سەلیمی دووپات كردبۆوەو نوسیبووی ناوی مامی سوڵتان سەفدەر، ناوی باوكی حەیدەر، ناوی دایكیشی سوڵتانە زبێدەیە، لەدواییشدا نوسیبووی، سڵاو بە هەمووان بگەیەنە، چاوی كچەكانی ماچ دەكەم و لەمنەوە هەواڵی كوڕەكانی بپرسە! ئینجا چەند دێڕێكی لەبارەی یاری فتبۆڵی چەند ڕۆژ لەمەوپێشەوەی نوسیبوو و لە دامێنی پەڕەكەشدا ئەمەی خستبووە سەر: خۆزگە سوڵتان سەلیمیش دەیتوانی بێتە سەیری یارییەكە!

كاتێ عوسمان لە پشووی دەرەوەدا ئەم شتانەی گێڕایەوە هەر پساین لەبەر پێكەنینێ بەڵام ئەو خۆی پێنەدەكەنی. دەیگوت ئەگەر مامۆستا ئەوانە بخوێنێتەوە كە نوسیوومن چ بكەم؟

چەند ڕۆژێكم بەم ترس و لەرزەوە بردنە سەرێ، كە مامۆستا چ باس و هەواڵێكی نەبوو هەموو گومانمان لە قسەكانی عوسمان پەیدا كرد. بەڵام دوێنێ كە ئەم باسە ئاشكرا بوو تێگەیشتین كە ڕاست دەكا!.

دەرسی یەكەم بوو مامۆستا دوای ئەوەی ماوەیەك دواكەوتبوو بە گرژو مۆنییەكەوە خۆی كرد بە پۆلدا. بە پێچەوانەی جارانەوە كە هەمیشە ڕووخۆش بوو. بە تووڕەییەوە گوتی:





- عوسمان هەستە وەرە سەر تەختە.

عوسمان هەستاو لەجێی خۆی ڕاوەستا، مامۆستا بەسەریدا شیڕاند:

- وەرە ئێرە.

عوسمان چووە سەر تەختە، مامۆستا گوتی:

- منداڵینە دوێنێ پرسیارێکی تاقیکردنەوەی مێژووی سروشتیم دابوونێ. ئێستا عوسمان دەیەوێ وەڵامەکەیتان بۆ بخوێنێتەوە!.

دیسانەوە وامانزانی چونکە باشی وەڵام داوەتەوە مامۆستا دەیەوێ بۆ ئێمەی بکا بە سەرمەشق بەڵام ڕەنگی عوسمان واسوور هەڵگەڕابوو دەتگوت چەوەندەری کوڵاوە.

- بخوێنەوە! ئەگەر یەك وشەی بەجێ بێڵی خۆت دەزانی. لەپێشدا پرسیارەکان بخوێنەوە ئینجا وەڵامەکانیان!.

عوسمان دەستی پێکرد:

پرسیاری یەکەم ـ (با) چیەو چۆن پەیدا دەبێ؟

مامۆستا گوتی:

- وەڵامی ڕاست ئەمەیە کە بە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرماوە، هەوای گەرم سوکتر دەبێ و بەرەو سەرەوە دەڕوات و هەوای ساردیش کە دەیەوێ بەرەو خوارەوە بێت لێکدەدەن و (با) پەیدا دەبێ.

ئێستا گوێتان لە وەڵامی ئەم هەڤاڵەتان بێ:

عوسمان وەکو پەیکەر بێ جوولە واقی وڕما بوو مامۆستا گوتی:

- بۆ لاڵ بووی کوڕە؟ دەی بڵێ!.



عوسمان دەستی پێکرد:

((کاتێ سوك بوو دەچێتە سەرێ.. با..با.))

عوسمان ڕاوەستاو مامۆستا بەسەریدا شیڕاندەوە: ((یاڵڵا بخوێنەرەوە))

عوسمان دەستی پێکردەوە:

((با - بۆ تیپی فوتبۆڵی - گالاتاسرا - غەمبارە! دەگەڵ ئەوەشدا کە تیپەکە لە هەفت تایمی یەکەمدا ڕووی بەرەو (با) بوو کەچی زۆر باشی یاری دەکرد! یاریکەرەکان وەکو (با) دەفڕین ئافەرین بۆ (با)!))

پرسیاری دووەم: گەردەلوول چییەو چۆن پەیدا دەبێ؟.

((وەڵام: (با) یەك کە لە هەر سانیەیەکدا خێراییەکەی بیست مەتر بێت پێیدەڵێن گەردەلوول یاریکەرانی گەلاتاسرا ئەمڕۆ گەردەلوول ئاسا یارییان دەکرد. داخەکەم کە ناتوانم باشی باس بکەم. لەو گەرداوەدا مەتین کەوت و داوەرەکە کردیە پەنارتی!))

کاتێ عوسمان خەریك بوو پەڕەکەی دەخوێندەوە قوتابییەکان متتەقیان لە خۆیان بڕیبوو.

عوسمان هێندە سەغڵەت بوو بوو کە خەریك بوو دەستبکا بەگریان!

مامۆستا پرسی:

- ئەمە یانی چی؟

عوسمان کە خەریك بوو فرمێسکی بێنە خوارێ بێدەنگ مایەوە، مامۆستا دڵی پێ سووتاو گوتی:

- تۆ قوتابییەکی باش بووی، ئەمەم لەتۆ چاوەڕێ نەدەکرد. بڕۆ لەجێگای خۆت دانیشەوە.

عوسمان وەکو سەرخۆشان بە لۆژە لۆژ چۆوە جێیەکەی خۆی و دانیشتەوە.

ڕاستی من لەم ڕووداوە زۆر خۆشحاڵ بووم. لەدەرەوە بە عوسمانم گوت: چۆنی؟ لەبیرتە گوتم مامۆستا کاغەزی تاقیکردنەوەکان دەخوێنێتەوە؟

ئەو شەوە یەکێك لە دەستە خوشکەکانی دایکم میوانی ئێمە بوو، یەکەمجار بوو ئەم ژنە ببینم، لێی پرسیم: ((دەچییە کام قوتابخانەو پۆلی چەندی؟)) کاتێ پێم گوت دەچمە فلانە قوتابخانە بە دەنگێکی بەرزەوە پێکەنی. دایکم پرسی:

مەسەلە چییە؟

بە پێکەنینەوە دەستی بەگێڕانەوە کرد:

- دوێنێ شەوێ لە ماڵی مامۆستاکەتان بووم شتێکی سەیر ڕوویدا، دیتم لەسەر مێزەکەی کۆمەڵە کاغەزێکی زۆر کەڵەکە کرابوو، کە هی تاقیکردنەوەی ڕۆژانەی قوتابییەکانی بوو لێم پرسی: ((چۆن دەستت دەگا ئەم هەمووانە بخوێنیتەوە؟)).

وەڵامی دایەوە:

((پێویست ناکات هەمووان بخوێنمەوە، زۆربەی قوتابییەکان قوتابی چاکن! دەتەوێ یەکێکیان ببینی؟)) پەڕەیەکی جیاکردەوەو دایمێ. زۆر جوان نوسرابوو، سەرە دێرەکانی بە قەڵەمی ڕەنگ نوسیبوون، بەڵام کە خوێندمەوە دیتم زۆر پەرش و بڵاوی نوسیوە و هەمووی دەربارەی تیپی فوتبۆڵە!.

پەڕەکەم دایە جەنابی مامۆستای. کاتێ خوێندیەوە هێندە تووڕەبوو مەپرسە و گوتی من ئەمەم لەم قوتابییە چاوەڕێ نەدەکرد!



بەم جۆرە دڵنیا بووم کە عوسمان ڕاستە و چاوەڕێی ئەوە نەبووم لە مامۆستاکەمان.

ئاواڵی خۆشەویستم ئەگەر ماندووشم کردبێت داوای لێبوردن دەکەم. چاوەڕێی وەڵامتم، سلاو بە هەموو ئاواڵەکان بگەیەنە. هەواڵی تازەشیانم بۆ بنووسە.

**ئاواڵت - زەینەب یالکەر**

# ئازاری ویژدان

ئەستەمبۆڵ 25ی دیسامبەری 1966

زەینەبی خۆشەویستم نوسیبووت کە نامەکانم ڕێکوپێکن و شایانی خوێندنەوەن. ئەم هاندانەی تۆ بووە هۆ کە زیاتر تێبکۆشم، هەموو جارێك نامەی باشتر بنووسم، بەڵام باسێك کە ئەمجارە دەمەوێ بینووسم بە پێچەوانەی جاران نەختێك غەمناوییە. کاتێ مامۆستا ئەم چیرۆکەی دەگێڕایەوە، وا سەغلەت بوو بووم کوڵم هەستابوو گریانم هاتێ.

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر حوسێن خەریکی خوێندنەوەی کتێبی خوێندنەوە بوو، گەیشتە جێگایەك کە وشەی ((ئازاری ویژدان))ی تێدابوو، مامۆستا دەربارەی ئازاری وێژدان زۆری هێناو بردو لەسەری ڕۆیی و ئەوجا پرسی:

– تێگەیشتن ئازاری ویژدان چییە؟.

هەموو بەیەك دەنگ وەڵاممان دایەوە:

بەڵێ مامۆستا تێگەیشتین.

مامۆستا گوتی:

– ئەوەی تێگەیشتووە با نموونەیەك لە ئازاری ویژدان بێنێتەوە.

کەس وەڵامی نەدایەوە. خۆ ((یاشار)) دەناسی؟ ئەو ئێستاش هەرلە ڕیزی هەرە دواوە دادەنیشێ و لەوێ یا یاریی پولێنێ دەکا یا کاریکاتێران دروستدەکات.

مامۆستا بانگی کرد:



یاشار هەستە بزانم، تا ئێستا شتێکت بەسەر هاتووە کە بابەتی ئازاری ویژدانی تێدا بێ؟

یاشار هەروەکو گوێشی لە قسەکانی مامۆستا نەبووبێ، تەنانەت سەریشی هەڵنەبڕی. ئەگەر وەبیرت بێ مندالێکی شەیتان و بزۆزە، ئەمەش چاکترین ڕێی خۆ دەربازکردن بوو، ئەگەر بیگوتبایە (بەڵێ) دەبوو باسی بکات ئەگەر بیشیگوتبایە (نا) مامۆستا وازی لێنەدەهێنا. چونکە بەلای مامۆستاکەمانەوە، نابێ ئادەمیزاد هەبێ کە بەدرێژایی تەمەنی چەند جارێك تووشی ئازاری ویژدان نەبووبێ!.

مامۆستا دووبارە پرسیارەکەی دووپات کردەوە:

– یاشار لەگەڵ تۆم بوو، چ جاران تووشی ئازاری ویژدان بوو وی؟.

– نەخێر قوربان.

یاشار بەم قسەیە خۆی ڕزگار کرد، بەڵام سلێمان کە دەیویست خۆی بنوێنێ پەنجەی بلند کرد:

– قوربان من بیلێم... قوربان من بیلێم.

مامۆستا لەسەرخۆ سەرێکی لەقاند:

– بلێ بزانم دووچاری چ جۆرە ئازارێکی ویژدان بوو وی؟.

– بەڵێ مامۆستا، زۆریش!.

– باشە بلێ بزانم.

– کامەیان بلێم قوربان؟!.

هەموو منداڵەکان لە پڕمەی پێکەنینێیان دا... دیار بوو سلێمان دەیویست کات بە ڕێکا، یا لە خۆیەوە شتێك دروستبکات و بیڵێ... مامۆستاش بە پێکەنینەوە گوتی:

– یانی سلێمان بەڕاست هێندەت ئازاری ویژدان بەسەرهاتووە، کە بڵێی ئەمەیان بڵێم یان ئەوەیان...؟

– بەڵێ قوربان، زۆرن.

– دەی باشە، یەکێکیان بڵێ...

سلێمان وەکو جاران تفێکی قووتدایەوە، لەبیریشتە کە سلێمان کاتی وەڵامدانەوە خۆ دێنێ و دەبا بەڵام تاتف قووت نەداتەوە ناتوانێ بدوێ. ئەمجارەیان خۆ هێنان و بردنەکەی لەجاران زیاتر بوو دوای ماوەیەك دەستی بە گێڕانەوەی باسەکە کرد:

((پێویستە هەمیشە ڕێزی گەوران بگیرێت و ئاگاشمان لە چووکان بێت..))

چونکە سلێمان قسەکانی بەم قسە بێ سەرو پایانە دەستپێکرد بوو مامۆستا لێی هاروهاج بوو بوو... لێی پرسی:

– باشە، باشە، بڵێ بزانم دوایی مەسەلەکە گەیشتە چی؟

سلێمان دیسانەوە تفێکی قوتدایەوەو گوتی:

– دایکێك خەریك بوو ئاوای ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد، لەناوەڕاستی قسەکانیدا لە دەرگای دەرەوە دەدرێ...

دایکەکە لە پەنجەرەیرا تەماشا دەکات دەبینێ ئەوە خەزووری لە پشت دەرگاوە وەستاوە. بە کوڕەکەی دەڵێ: ((بڕۆ دەرگاکە بکەرەوە، باپیرت هاتووە، پێی بڵێ من لەماڵەوە نیم)).



منداڵە دەچێ دەرگاکە دەکاتەوە و دەڵێ ((باپیرە دایکم چۆتە دەرەوە..))

پیرەمێردە وەڵام دەداتەوە ((بە دایکت بڵێ هەر کاتێ دەچێتە دەرەوە با سەری لە پەنجەرەیرا نەهێنێتە دەرێ!!!

سلێمان دیسانەوە تفێکی دیکەی قووتدایەوەو بێدەنگ بوو، مامۆستا پرسی:

– ئەم باسە بەسەر خۆت هاتووە؟.

– نەخێر لە ڕۆژنامامدا خوێندۆتەوە!!

– باشە جا تۆ تووشی ئازاری ویژدان بووی؟ خۆ ئەمە چ پەیوەندییەکی بە تۆوە نەبوو.

– من نا قوربان من بۆ؟... دایکی منداڵەکە دووچار بوو.

ئەمجارە مامۆستا لە قوتابییەکانی دیکەی پرسی:

– کێ خۆی دووچاری ئازاری ویژدان بووە؟ با بێت باسی بکا...

چەند کەسێك سەرو شتێکیان گوت بەڵام هەمووی پەیوەندییان بە کەسانی دیکەوە هەبوو.

مامۆستا گوتی:

– وادیارە هیچ کامێکتان نازانن ئازاری ویژدان مانای چی؟ هەر کەسێ کە ئازاری وێژدان دەچێژێ دەبێ بەسەرهاتێکی خراپی بەسەر هاتبێ و بووبێتە هۆی سەغڵەتییە کەسانی دی بە جۆرێك کە جگە لە پەشیمانی و داخ و خەفەت خواردن چارەیەکی دیکەی نەبێ.

مامۆستا کەمێ بێدەنگ بوو و لە دواییدا لەسەری ڕۆیی:

– ئێستا من نموونەیەکتان لە ئازاری ویژدان بۆ دەگێڕمەوە.

هەموو ورتەمان لەخۆ بڕیبوو و بە وردی گوێمان دابووە قسەکانی مامۆستاکە گوتی:

من قوتابی ناوەندی بووم. بەڕێوەبەرەکەمان پیاوێکی زۆر ڕەقەکار بوو. تازە قوتابخانەکان کرابوونەوەو دەرس دەستی پێکردبۆوە. چەند قوتابییەکی تازە، هاتبوونە پۆلەکەی ئێمە، هێشتا ناویانمان نەدەزانی. یەکێك لەوان هەمیشە دەستی چەپی دەگیرفانێدا بوو. هیچ کاتێك دەستی لە گیرفانی دەرنەدەهێنا.. ئێمەش هێشتا زۆر لێك شارەزا نەبوو بووین و نەماندەتوانی لێی بپرسین ((بۆ دەستت دەرناهێنی؟)) ڕۆژێکی دوای نیوەڕۆیە کە هاتبووینەوە قوتابخانەو لەحەسارێ خەریکی یاریکردن بووین. بەڕێوەبەری قوتابخانە هاتە حەسارێ... بانگی منداڵەکەی کرد. منداڵ بە ڕاکردن و بێ ئەوەی دەستی لە گیرفانی دەرێنی چووە بەردەمی بەڕێوەبەرو ڕاوەستا!.

ئێمە کە شارەزای بەڕێوەبەر بووین، دەمانزانی لە کردەوەی منداڵەکە چەند پەست دەبێ، دەستمان لەیاری هەڵگرت و چاوەڕوان وەستاین تا بزانین کار دەگاتە کوێ!.

بەڕێوەبەر لەم ڕەفتارەی منداڵەکە زۆر تووڕە بوو بوو نەڕاندی:

- بۆ دەستت ناوەتە گیرفانت؟

- منداڵەکە وەڵامی نەدایەوە، و سەری بەردایەوە. ئێمەش هەموو لە دەوری بەڕێوەبەر کۆبووینەوە. دووبارە نەڕاندییەوە:

- لەگەڵ تۆم بوو، گوتم دەستت دەربێنە.

منداڵ دیسانەوە نقەی نەکردەوە. بەڕێوەبەر ئەمجارەیان توندتر شیڕاندی:

- دەڵێی کەڕی؟

منداڵەکە بەهێمنی و بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە وەڵامی دایەوە:



- گوێم لێیە قوربان.

بەڕێوەبەر کە زۆر تووڕە بوو بوو گوتی:

- ئێرە جێگای سینگ دەرپەڕاندن و ملهوڕی نییە. گوتم دەستت دەرێنە... چۆن منداڵەکە گوێی نەدایە و دەستی لە گیرفانی هەر دەرنەهێنا، بەڕێوەبەر زللەیەکی وای لە بناگوێی دا ئاگری لە چاوان بەردا! زللەکە هێندە بەتین بوو منداڵەکە نەیتوانی خۆی ڕاگرێ، کەوت و دەستی لە گیرفانی هاتە دەرێ!!!

بەم دیمەنە هەموو واقمان وڕما. بێدەنگییەکی سامناك هەموو لایەکی داگرت و لە دواییدا چرپە چرپ دەستی پێکرد.

بەڕێوەبەر خۆشی لە ئێمەی خراپتر لێهات، وەکو کۆتەڵ بێ جووڵە ڕاوەستا و لەجێی خۆی وشك بوو، خۆشی نەیدەزانی چی بکات و چۆن سەروبنی کێشەکە وەك خۆی لێ بکاتەوە، چونکە منداڵەکە دەستی چەپی نەبوو و دەستە دەستکردەکەی هاتبووە دەرێ و کەوتبووە گۆڕێ!. تازە تێگەیشتین بۆچی ئەو بەستەزمانە هەمیشە دەستی چەپی لەگیرفانی دەنا.

بەڕێوەبەر کە چاوی پڕ بوو بوون لە فرمێسك، منداڵەکەی لە عەردی هەڵگرتەوە و گوتی:

- کوڕی خۆم بۆچی لە پێشدا نەتگوت؟.

دوایی دەستی منداڵەکەی گرت و بردییە ژوورەکەی خۆی. بەڵام ئەمە هیچ سوودێکی نەبوو. کوڕیژگەکە لە بەیانیڕا نەهاتەوە قوتابخانەو هێندەش تەریق بوو بۆوە تەنانەت نەچووە قوتابخانەیەکی تریش لەدواییدا بیستمان بەڕێوەبەر داوای لێبوردنی لە منداڵەکە خۆی و لە دایك و باوکیشی کردووەو گفتی داوە کە بە هەموو جۆرێك ئاگای لێی بێت، بەڵام کوڕە دیسانەوەش هەر ئامادە نەبوو بێتەوە قوتابخانە.





کاتێ مامۆستا ئەم بەسەرهاتە ناخۆشەی گێڕایەوە، بێدەنگییەکی سارد پۆلەکەی داگرت و چیرۆکەکە هەندە کاریگەر بوو ماوەیەك هەر نەمانتوانی ورتە بکەین، کاتێ زەنگی پشوودانیان لێداو مامۆستا خەریك بوو بچێتە دەرەوە گوتی:

– بەم جۆرە بەڕێوەبەرەکەمان تا دوا ڕۆژی ژیانی لە داوی ئازاری وێژدان ڕزگاری نابێ. بەمە دەڵێن ئازاری وێژدان.

هەر کە مامۆستا لە پۆل چووە دەرێ. سلێمان گوتی:

– مامۆستا باسی ئی خۆی نەکرد!

یەکێ لە منداڵەکان وەڵامی دایەوە:

– مامۆستا بێگوناهە، هیچ کەسێ ئیشەخراپەکانی خۆی لەبەرچاو نییە، ئێمە هەموومان هەر خراپەی خەڵکیمان لەبەر چاوە.

بەیانی ئەو ڕۆژە کە هاتینەوە قوتابخانە دەمیر گوتی:

– من باسی ئازاری ویژدانم لە باوکم پرسی گوتی:

منداڵان دووچاری ئازاری ویژدان نابن. ئازاری ویژدان هەر هی گەورانە.

من ڕایەکەی باوکی دەمیرم پێ ڕاستە، ئێوە چی؟

دەزانم دەرس و مەشق و ئەرکی ماڵەوەت زۆرن بەڵام هەوڵبدە وەڵامی نامەکانی منیش زۆر دوانەکەون... نازانی چەند بەتاسەی گەیشتنی وەڵامەکانتەوەم.

هەموو ڕۆژێ کە دێمەوە ماڵێ لە دایکم دەپرسم ((نامەم بۆ هاتووە یان نا؟.))

**سەرکەوتنت دەخوازم**

**ئەحمەد تارباری**



## ئای کە شەوی جەژنێ خۆش بوو

برام ئەحمەد:

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر نامەکەت گەیشت، دوێنێش کارتی پیرۆزبایی ساڵی تازەتم پێگەیشت، سوپاسی هەردووکیانت دەکەم.

منیش چەند ڕۆژێك لەمەوبەر کارتی پیرۆزباییم بۆ ناردبووی، دەبێ گەیشتبێ. دیارە کارتی پیرۆزباییەکەی من وەك ئەوەی تۆ جوان نەبوو، چونکە نەك هەرمن بەڵکە هیچ کەسێك ئەو سەلیقەی تۆی نییە، کارتەکەتم پێشانی هەموو ئاواڵەکاندا. هەموویان پەسەندیان کردو ئافەرینی ئەو سەلیقەیەیان کردی کە هەتە.

شەوی جەژنمان زۆر خۆش لێ ڕابووردو شایانی ئەوەیە بۆتی باس بکەم.

دایکم و باوکم دوو مرۆڤی قایمکارن... دیارە بەلای خۆیانەوە ئەو خووەیان خوویەکی زۆر چاکەو هەمیشە دەڵێن ((هەموو کەسێ پێویستە بە ئەندازەی بەڕەی خۆی پێ ڕاکێشێ.))

هەمیشەش دەمی ئامۆژگارییان بەسەر ئێمەوەیەو دەڵێن:

((منداڵینە ئەگەر دەتانەوێ ژیانێکی ئاسوودەو ئارامتان هەبێت خۆ لە ڕژان و پژانی بێ جێ بپارێزن، ئاگاداری پێنووسەکانتان بن. دەفتەرەکانتان نەدڕێنن و خراپیان نەکەن)). ڕۆژێکیان دایکم دیتی مەتین لە نوسینەوێدا دێڕی بەجێهێشتووە نیو سەعاتی ڕەبەق ئامۆژگاری کرد:





– کوڕی خۆم زێدەڕۆییە ( هەر دڵۆپەیە دەبێتە دەریا ) ئەگەر ئاوا هەموو ڕۆژێ بەم شێوەیە پەڕەیەك خراپکەی تا سەری ساڵ دەبێتە دەفتەرێکی گەورە. حەیف نییە!.

هێندەیان ئەم قسانە دووپات دەکردنەوە، تا دەهات جۆرێك نارەحەتی و یاخیگەریەتی و سەرپێچی لە دڵ و دەروون و گیانی ئێمەدا پەیدا دەبوو!.

بەتایبەتی کاتێ کە باپیریشم هاتە مەیدانێوە، ئیدی بەیەکجاری کارەکە لەکار ترازا. باپیرە چوو دوو دەخیلەی بۆ من و مەتین کڕی و کاتێ کە دەخیلەکانی دەداینێ گوتی:

– خۆشەویستەکانم ((ئەگەر یەك نەبێ هەزاریش نابێ)). ئەم قسەیە لە گوێ بگرن ((دڵۆپ دڵۆپ کۆبێتەوە دەبێتە دەریا))

لەدواییدا لەمن پرسی ((ئەم قسانە مانایان چییە؟))

ئەو خوویەکی تایبەتی هەبوو. هەر کاتێ شتێکی گوتبایە لەو کەسانەی دەوروبەری خۆی دەپرسییەوە ((ئەمە مانای چییە؟)).

من وەڵامم دایەوە:

– باپیرە دەبێتە دەریا... زۆر دەبێ!

باپیرە وەڵامەکەمی زۆر لێ خۆشهات یەك ئافەرینی درێژی کردم ((ئا.. فەر.. رین)) هەریەکەی لیرەیەکی بەخشیش داینێ، بەڵام من و براکەم نە ئەم پارەیەمان دەویست و نە ئارەزووشمان لێبوو ئەم ئامۆژگارییانە ببیستین...

جەژنی ئەمساڵ تاکە قازانجێکی ئێمەی تێدا بوو، ئەویش ئەوە بوو بۆ تا هەتایە لە بیستنی ئەم قسانە ڕزگارمان بوو.

دایکم و باوکم تا بەخۆڕایی پارە خەرج نەکەن شەوانی سەری ساڵی تازە لەماڵەوە دەمێننەوەو بۆ هیچ جێیەك ناچن... ئەمساڵ هاوکارەکانی باوکم کە



دراوسێشمانن بڕیاریان دابوو شەوی جەژن لە ئوتێلێکی گەورەدا ڕابوێرن و بەبێ ئاگاداری باوکم هەموو شتێکیان ڕێك خستبوو و جێگاشیان بۆ دایکم و باوکم دیاری کردبوو.

کە باوکم بەمەی زانی زۆر سەغڵەت بوو، بەڵام کار لە کارترازا بوو ناچاریش بوو پارەی ئوتێلەکە هەر بدات، بەسەرخۆی نەهێنا.

دراوسێکان لە ئێوارەوە جێگای خۆیان لە ئوتێلەکە داگرت، بەڵام باوکم و دایکم لەبەر ئێمە لەماڵەوە مانەوەو نانی ئێوارەمان پێکەوە خوارد. زۆرمان یاری کرد، نزیکی نیوە شەوێ ئێمەیان لای نەنکم و باپیرم بەجێهێشت و بۆخۆیان لێیاندا و ڕۆیشتن. تا هەر نەبێ پارەکەیان بە خۆڕایی نەڕوا. خوشکە گەورەکەشمیان دەگەڵ خۆیاندا برد. ئێمەش کەمێکمان یاری کردو پێکەنین و ئەوجا نوستین... کاتێ لەخەو هەستام بێدەنگی هەموو لایەکی گرتبۆوە. وامزانی دایکم و باوکم هێشتا نەهاتوونەتەوە هێندێکم لەسەرجێی ئەودیو ئەودیو کرد، دەو دەمیدا مەتین هاتە ژوورێ و گوتی:

– ئەمانە چیان لێهاتووە؟!.

– بۆ، چی بووە؟

– وەرە سەیرکە خوشکم بێ ئەوەی جلەکانی بگۆڕێ لەسەر کەرەوێتەکە کەوتووە! بابە لەسەر عەردی ڕاکشاوە، دایکیشم کەس نازانێ لەکوێیە!.

لەجێی خۆم ڕاستبوومەوە و ڕامکردە هۆڵەکە، خوشکم ئارایشتێکی خەستی کردبوو و لەسەر کەرەوێتەکە کەوتبوو و ئەو پارچە کاغەزە ڕەنگاو ڕەنگانەی لە ئوتێلەکە بەسەریاندا هەڵدابوون هێشتا بە قژ و جلەکانیەوە هەر مابوون، باوکیشم کە لەسەر مافوورەکە کەوتبوو ماسکێکی سەیری بە ڕووی خۆیەوە کردبوو و کڵاوێکی کاغەزی درێژکۆلەی ڕەنگاو ڕەنگیشی لەبەر پێیانەوە کەوتبوو، دایکم لە سەر جێگاکەی خۆی نوستبوو، بەڵام تاکێکی پێڵاوەکەی





لەڕاڕەوەکەدا کەوتبوو و ئەویدیشیانی لەسەر پێلکانەکان جێمابوو. دایکم داپۆشی، خوشکەکەشمان بەزەحمەت ڕاکێشا و فڕێماندایەوە سەر جێگاکەی خۆی. بەڵام هەرچییەکمان کرد نەمانتوانی باوکمان ڕاست کەینەوەو ئاگای بێنینەوە.

بەیانی دوای نیوەڕۆ یەکە یەکە وەئاگا هاتنەوە. دایکم لەپێش هەمووواندا هەستا، دوایی باوکم بەهۆش هاتەوە، پاش هەمووان خوشکم لەخەو هەستا. هەرکە چاوی کردەوە گوتی:

– ئای خۆ گەردانەکەم نەماوە.

خۆشی نەیدەزانی لەکوێی داناوە!.. باوکم و دایکم دەستیان کرد بە پەکو پف. لە قسەکانیاندا دیار بوو کە جەژنی ساڵی تازەیان زۆر گران لەسەرکەوتووە. دایکم وەك پرسەداران دەستی نابووە کەلەکەی و دەیگوت:

– جا باشە، تا سەری مانگێ چ بکەین؟!.

باوکم وەڵامی دایەوە:

– یارمەتی وەردەگرین.

ئەم جۆرە قسانە تا ئەو کاتە لە ماڵی ئێمەدا نەبیسترابوون.

دایکم من و مەتینی بردە لاوە و گوتی:

– منداڵینە ئێوە پارەکانتان بدەن بە من.. بەیانی دەتان دەمەوە!.

دەخیلەکانمان شکاندن و پارەکانمان دا بە دایکمان.

دوای چەند دەقیقەیەك لە دەرگا درا کچی دراوسێکەمان نامەیەکی لە باوکییەوە هێنا بوو. کاتێ نامەکەم بۆ باوکم دەبرد بە ڕێگاوە خوێندمەوە نوسرابوو:



((ئاواڵی خۆشەویستم دەزانی دوێنێ شەوێ چۆنم لێقەوماوە؟. تەنانەت لیرەیەکیشم لە گیرفان نەماوە!. نایەتەوە بیرم چۆن هاتوینەوە ماڵێ. هەردەبێ ئێوە ئێمەتان هێنابێتەوە! زۆرت سوپاست دەکەم ئەگەر بکرێ سەد لیرەم هەر بۆ بنێری)).

نامەکەم دایە باوکم.. خوێندیەوە و لەگەڵ دایکمدا دەستیکرد بە چرپە چرپێ.

وای تێگەیشتم باوکم نەیدەویست بە ئاواڵەکەی بڵێ ((منیش نیمە)) ناچار ئەو پارەیەی کە لە دەخیلەکەی ئێمەیان دەرێنابوو ناردیان بۆ دراوسێکەمان و لەهەمان کاتیشدا هەوڵیان دەدا ئێمە شتێك لەم بەسەرهاتە تێنەگەین.

باوکم پرسی:

– مەتین لە کوێیە؟.

گوتم:

– خەریکی دەرسەکانیەتی.

باوکم بانگی کردبێت، بەڵام مەتین خۆی گنخاند دایکم چوو بزانێ چ دەکات. دیاربوو وەکو جاران پێنووسەکەی ون کردبوو و خەریك بوو لێیدەگەڕا. دایکم زۆر تووڕە بوو و قیژاندی:

– ئەم منداڵە پاشەکەوت کردن نازانێ! هێندەم قەڵەم بۆ کڕیت جاڕس بووم.

باوکیشم قسەکانی پێشووی دووپات کردنەوە:

((ئەگەر یەك نەبێت... هەزاریش نابێت...))

من قسەکەم پێبڕین و گوتم:

((دڵۆپ دڵۆپیش کۆ ببێتەوە هەر نابێتە دەریا!))

باوکم نێوچەوانی تێکنا:

((چۆن نابێتە دەریا؟))

((نابێت و ئەھ؟))

((ئەی دەبێتەچی؟))

((ئەگەر جێگایەك کە دلۆپەکانی تێدەڕژێ چاڵ بێت دەبێتە دەریا. بەڵام ئەگەر چاڵ نەبێت دەبێتە لافاو و هەموو شتێك لەگەڵ خۆیدا ڕادەدا!)) باوکم بە تووڕەییەکەوە سەیرێکی کردم و دایکم گوتی:

– ئەگەر جارێکی دی ئەم جۆرە قسانە بکەیت بیبەری تیژت دەزاری دەکەم. بەڵێ بۆ یەکەمجار باوکم وازی لە ئامۆژگاری کردنمان هێنا و سوپاس بۆ خوا لە بیستنی ئەم قسە پڕوپووچانە ڕزگار بووین.

**چاوەڕوانی نامەتم**

**زەینەب یالکەر**



## ئێمەش شەوە جەژنێکی خۆشمان ڕابوارد

ئەستەمبۆڵ 10ی کانووی دووەمی 1967

خوشکم زەینەب... ماوەیەکە کارتی ساڵی تازەتانم پێگەیشتووە.. زۆر سوپاس. ئێمە شەوی جەژنمان لە ماڵی مامە گەورەکەم ڕابوارد.. لەبەر ئەوەی ماڵی ئەوان گەورەیە... هەموو مامەکانی تریشم لەوێبوون چونکە لێم بۆتە خوو شەوانە زوو بنووم، مانەوەم تا نیوەی شەوێ کەمێك گران بوو، هەروا بە گوێ لە ڕادیۆ گرتنێوە خەوم لێکەوتبوو. بەلانی کەمەوە خوا ئەوەندەی داونێ کە ساڵی تازە لە بیستنی ئامۆژگاری بێ جێ ئاسوودە بن! بەڵام من باوەڕناکەم تا دوا ڕۆژی تەمەنم لەمە ئاسوودەبم! ئەمەش لەبەر ئەوەی کە باوکم لە دەرەوە یەکجار دەست و دڵ بڵاوەو بێ حیساب لێدەخوڕێ، بەڵام کە دەگاتەوە ماڵێ دەستدەکات بە ئامۆژگاری و باسی پاشەکەوت کردنێ.

ئێمە بەتەواوی لە خوو و ڕەوشتی شارەزایین هەر کاتێ زۆرتر پێ لە ئامۆژگاری کردنێ دابگرێ تێدەگەین کە شەوی ڕابوردوو لەدەرەوە زۆری خەرج کردووە:

((هێندە دەرمانەی ددان مەخەنە سەر فلچە.. زیانبەخشە.. دەزوو مەپسێنن... ڕۆژنامە کۆنەکان فڕێ مەدەن، ئاگاتان لێیان بێت، کیسەکاغەزان دروستکەن و بیانفرۆشن)).

ئامۆژگاری کردنەکەشی بەجەهەننەم! ئەو شەوانەی کە لەگەڵ ئاواڵەکانیدا دەچێتە ڕابواردنێ، تووڕەیی و سەغڵەتییەکەی ماڵەوەی

له توانای کەسدا نییە. لەبەر ئەوە شەوی جەژن لەماڵەوە مابۆوەو پارەشی بۆ ئێمە زۆر خەرج نەکردبوو سوپاس بۆ خوا لە بۆڵە بۆڵ و تووڕەییشی ئاسوودە بووین جا بۆیە زۆر خۆشمان ڕابوارد. بەتایبەتی کە یەك دەستە بۆیەشی بە جەژنانە دا بە من، پشووی هاوین تابلۆی جوان دەکێشم و بۆت دەنێرم.

**ساڵی تازە لە خۆت و کەسوکارت پیرۆز بێت**

**سەرکەوتنت دەخوازم**

**ئەحمەد تاربای**



## باوکی هەشت کچ

ئەنقەرە 20ی کانوونی دووەمی 1967

ئەحمەد.. نامەکەت گەیشت خۆشحاڵ بووم کە ئێوەش سەری ساڵێکی تازەی خۆشتان ڕابواردووە. ئیشاڵلا هەمیشە هەر باش بیت. دوو سێ ڕۆژ لەمەوپێش ڕووداوێکم پێشهات کە زۆر سەرنجڕاکێش و بیستەنییە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بڕیار بوو ئەم باسە بۆ کەس نەگێڕمەوە بەڵام چونکە تۆ لە ئەستەمبۆڵێ دووری قەیناکا، قسەکە لە بەینی خۆمان دەرناچێ.

ئاواڵێکم هەیە ناوی حیکمەتە، ڕازێکی بۆ درکاندم کە شایانی بیستنە... من کە ئەم ڕازەت لا ئاشکرا دەکەم پێشەکی داوات لێدەکەم ئەگەر ڕێگایەکت بۆ چارەسەرکردنی دۆزییەوە بۆم بنووسی... لەیەکەم ڕۆژ لێرە کە چوومە ژووری پۆلێ حیکمەت لە هەموانی زیاتر سەرنج ڕاکێشام، منداڵێکی بێدەنگ و لەسەرخۆیە... زۆر لاوازو ڕەنگ پەڕیوەیە..

حیکمەت نە لەگەڵ کچان یاری دەکرد، نە لەگەڵ کوڕان.. تەنیا لە سوچێکا خۆی کز دەکرد.

ڕۆژێك کە مامۆستای وەرزش کچ و کوڕەکانی لێك هەڵاوێر دەکردن حیکمەت چووە ڕیزی کچەکانەوە... زۆرم پێ سەیر بوو.. ڕاستە ((حیکمەت)) ناوی کوڕانیشەو ناوی کچانیش، بەڵام سەرو سیمای ئەو بەتەواوی کوڕانە بوو... قژی وەکو کوڕان دادێناو چاکەت و پانتۆڵیشی لەبەر دەکرد! لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئاشکرابوو کە حیکمەت کچە، هەر بۆیەش پەیوەندیەکی زۆرم لەگەڵ پەیدا کرد و بووینە ئاواڵ... چەند ڕۆژێك لەمەوبەر درەنگ هاتە





قوتابخانه... زۆریش سەغلەت دیاربوو و بەچاوە هەڵاوساوەکانیڕا تێگەیشتم کە زۆر گریاوە... پرسیم:

((بۆ سەغڵەتی؟))

وەڵامی نەدایەوە بەڵام کاتێ زۆریم لێکرد گوتی:

((ڕاستی دەمەوێ پێت بڵێم بەڵام دەترسم بە هەمووان بڵێی...))

گفتم دایە کە لای کەس قسە نەکەم... ئینجا دەستیپێکرد:

((ئێمە هەشت خوشکین و برامان نییە...))

قسەکەیم بڕی و گوتم:

– تۆ زۆربەی ڕۆژان لەگەڵ براکەتدا دێیتە قوتابخانە.

– ئەوە برام نییە... ئەویش هەر کچەو جلی کوڕانە لەبەر دەکات!.

پرسیم:

– بۆ؟

– باوکم وای پێخۆشە!

گوتم:

– زۆر باشە، جا ئەوە سەغڵەتی بۆچییە؟

حیکمەت لەسەری ڕۆیی:

باوکم ئاواتی هەرە گەورەی ئەوە دەبێ خوا کوڕێکی بداتێ. کاتێ منداڵی یەکەمی کچ دەبێ هەر چۆنێك دەبێ دان بەخۆیدا دەگرێ و بەسەرخۆی ناهێنێ و بەخۆی دەڵێ:



((منداڵی دووەم هەر کوڕ دەبێت)). تەنانەت پێش ئەوەی منداڵی دووەم بێتە دنیاوە ناوێکی خۆشیشی بۆ هەڵدەبژێرێ. بڕوای وا دەبێ ئەگەر منداڵ پێش لەدایکبوونی ناوی کوڕانی بۆ هەڵبژێری کە بوو کوڕ دەبێ! نازانم لە بەخت و ناوچەوان ڕەشی دەبێ یا هۆیەکی دی کە منداڵی دووەمیشی هەر کچ دەبێ، باوکم لە بێ ئارامی و شەرمەزاریان دوو سێ ڕۆژان نایەتە دەرێ!

تا ماوەیەك قسەی لەگەڵ کەس ناکا.. هەرچەندە ئاواڵ و دۆستەکانی دڵی دەدەنەوە کە ((تۆ هێشتا جحێڵی و زۆرت ماوە)). بەڵام ئەم قسانە بە گوێی باوکمدا ناچێ و هەر دەڵێ: ((باشە ئەگەر منداڵەکانی تریش هەر کچ بن چ بکەم؟)).

کاتێ دایکی زگی بە منداڵی سێهەم پڕ دەبێ، باوکم بەخۆی دەڵێ ((خۆ هەموو منداڵەکان هەر کچ نابن! ئەمەیان هەر کوڕە؟)) دیسانەوە ناوێکی خۆش بۆ کوڕەکەی هەڵدەبژێرێتەوەو لە خۆشیان داوەتێکی گەورە دەکات، دەگاتە هەر کەسێك بۆی بە کوڕەکەی هەڵا دەڵێ! کاتێ لە ژووری منداڵبوونەوە هەواڵی دەدەنێ کە خوا کچێکی داوەتێ لە تووڕەییاندا وەکو شێتی لێدێ. چونکە بەهەمووانی گوتبوو منداڵەکەی کوڕ دەبێ، بە ماڵ و خیزانەکەی ڕادەگەیەنێ کە بە هەموو کەسێ بڵێن منداڵەکە کوڕە! خۆشی خۆی بە خۆشحاڵ پێشان دەدا و سەر لەنوێ داوەتێکی دیکەش بۆ ئاوەڵەکانی دەکات! دوای بوونی کچی سێهەم باوکم لەوە نائومێد دەبێت کوڕێکی بۆ بێنێ تەڵاقی دەدات... و ژنێکی دیکە دێنێتەوە..

لە بەدبەختییان ژنی دووەمیش هەر کچی دەبێت. ئەویش دووانە! لەولایشەوە دایکم کە شوو بە یەکێکی دی دەکاتەوە، کوڕی دەبێ! کاتێ باوکم بەمە دەزانێ وەکو شێت ڕوو لەکێو و بیابانان دەکات و ماوەیەك ون دەبێ!. دوای ماوەکە دێتەوە ژنی دووەمیشی تەڵاق دەدا! کە بڕیار دەدات ئەو بێوەژنە بێنێ کەسێ کوڕی بووە! وا دەزانێ ئەو ژنەیان کوڕی هەر بۆ دەهێنێ.

ڕۆژێ کە ژنی سێهەم دەچێتە ژووری منداڵبوونەوە باوکم بە دڵنیاییەکی تەواوەوە ئاهەنگێکی بەرفراوان ڕێك دەخات و بە خۆشی ئەم کوڕەیەوە کە پاش چەند سەعاتێکی دی دێتە دنیاوە زۆر دەخواتەوە. بەردەوام تەلەفۆن بۆ ژووری منداڵبوون دەکات و دەپرسێ ((منداڵەکە بوو یان نا؟)) نزیکی لای نیوەشەو باوکم بانگ دەکەنە سەر تەلەفۆن. بە ترس و لەرزێکەوە تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێ و دەپرسێ منداڵەکە کوڕە یان کچ؟ دیسانەوە پێی دەڵێنەوە کە خوا کچێکی داوەتێ! هێندە تووڕە دەبێ، کە تەلەفۆنەکە بە عەردیدا دەدات و وردو خاشی دەکات!.

کار لێرەشدا ناوەستێ. باوکم هەڕەشە لە ژنی سێهەمیشی دەکات کە ئەگەر منداڵی حەوتەمیش هەر کچ بێت ئەوا یەکسەر تەڵاقی دەدات و تا ماویشە روو لە ماڵێ ناکاتەوە!.

کاتێ منداڵی حەوتەم پێ دەنێتە ئەم دنیایەوە ژنەی بەستەزمان تکا لە سیستەرەکان دەکات کە ئەگەر منداڵەکە کچیش بوو بە هەمووان بڵێن کە کوڕە!)) چونکە منداڵی حەوتەمیش هەر کچ دەبێ سیستەرەکان دڵیان پێ دەسووتێ و مژدە دەدەنە باوکم کە: ((خوا کوڕێکی کاکۆڵ زێڕینی داویتێ!)) هەر کە باوکم ئەم مژدەیە دەبیستێ لەخۆشیان خۆی ناگرێ، ڕادەکاتە ژووری منداڵبوون و دەڵێ: ((کوا کوڕەکەم بۆم بێنن با بیبینم)). منداڵەکەی بە قۆنداغەیی پێشان دەدەن، بۆیە هیچی بۆ دەرناکەوێ داخوا کوڕە یا کچ.

ئەم کەڵەکە سێ مانگانی سەرگرت، لەم ماوەیەدا شادی و جموجۆڵێکی بێ ئەندازە لەماڵەوە فەرمانڕەوا بوو، باوکم تەواوی کاتی خۆی هەر لەماڵەوە لەلای ژن و منداڵەکەی بەسەر دەبرد.

هەمیشە (سوعاد)ی لەباوەش دەگرت و یاری دەگەڵدا دەکرد. دایکی سوعاد، تەنانەت ئێمەش، چیمان بویستبایە بۆی دەکڕین. لەبەر ئەوەی کە ئێمەش



بەختیاری خۆمان لە ساغی سوعادو ئاشکرا نەبوونی ڕازی 0سوعاد)ەوە دەزانی، هەرچی یارمەتیەکمان لەدەست هاتبایە دریغیمان نەدەکرد.

شوشتن و جل گۆڕینی سوعاد نهێنییەکی گرنگی ناو ماڵ و خێزان بوو و زۆر بەوردی و بەدزییەوە ئەنجام دەدرا! هەر بەو جۆرە کە هیچ نهێنیەك تاسەر هەر نامێنێتەوە، ڕازی سوعادیش دەبێ ڕۆژێ ئاشکرا هەر ببێت. ئەم مەسەلەیەو ئەو تەنگوچەڵەمانەی کە چاوەڕوان دەکران ڕۆژێ ئاشکرابوونی ڕازەکە بێنە کایەوە. بیری هەموومانی ئالۆزکردبوو و لە ڕێگایەك دەگەڕاین کە وردە وردە و بە پارێزەوە پەردەی بۆ باوکمان لەسەر لادەین.

سەرەنجام، ئەو کاتە هەر هات و کارێ کە نەدەبایە ببێ بوو و، ، قەوما.. هەموومان لە پرخەی خەوێکی خۆش دابووین کە لە دەنگ و هەراو جنێوی باوکمان وە ئاگا هاتین و ڕاستبووینەوە. باوەژنەکەمان وەکو بارانی بەهارێ فرمێسکی دا دەباراندن، دیار نەبوو باوکمان لەکوێ و چۆناو چۆن مەسەلەکە تێگەیشتبوو.. وەکو شێتی بەرهەڵدا هاواری دەکرد:

((بڕۆن لاچن لەبەر چاوم.. کەڵەك بازینە.. درۆزنینە. کوا دەعبای ئەم منداڵە!. دەتانەویست هەڵمخەڵتێنن؟. باوکتان واوا لێدەکەم!...)).

ئەو شەوە هەموو لەترسان چووینە ماڵی دراوسێکان و بەو هەموو هەوڵ و تەقەڵڵایەی دراوسێیەکان دایان، ئەو قایل هەر نەبوو لەکەری شەیتان بێتە خوارێ.. هەر دوو پێی دەکەوشێکی نابوو و دەیگوت: ((دەبێ ئەم ژنە هەر تەڵاق دەم!..)) ئەمرۆش بڕیارە بچنە دادگاو دیاریش نییە سبەینێ حاڵی ئێمە چۆن دەبێ.

لە قسەکانی حیکمەتیش هەم دڵگیربوون و هەم پێکەنینیشم دەهات. ماڵی باوکی هەشت کچ بێنە بەرچاوی خۆت و بزانە سەیر نییە؟ لەلایەکی تریشەوە





دڵم بۆ فرمێسکەکانی حیکمەت کە وەك مرواری بەچاوەکانیدا دەهاتنە خوارێ ببوە کەباب.

دوای نیوەڕۆ لە قوتابخانەوە هاتمەوە ماڵێ و لە دایکمم پرسی: ((کاتێ خوشکەکەم لە دایکبوو باوکم خۆشحاڵ بوو؟)).

دایکم بە سەرسامیەوە ماوەیەك تێمڕاماو ئینجا وەڵامی دایەوە:

– گوایە باوك هەیە بە دیاری خوا شاد نەبێت؟.

پرسیم:

– دایە ئەی کە من بووم؟ دیسانەوە هەر خۆشحاڵ بوو؟..

دایکم قیژاندی:

– ئەوە ئەم قسانە چین کچێ؟

من بێ ئەوەی گوێ بدەمە هات و هاواری دایکم گوتم:

((باشە ئەی کە دوای من مەتین بوو چۆن.. بەوە زیاتر خۆشحاڵ و شادتر نەبوو؟))

– بێگومان، ئاهەنگێکی گەورەشی بۆ ئاواڵەکانی گێڕا.

من لە سادەیی و ڕاستگۆیی دایکم خوێنم هاتبووە جۆش و پرسیم:

((ئەگەر منداڵی سێهەمیشتان کچ بوایە، کار هەر بەم جۆرە دەبوو؟))

– دەمتوانی چ بکەم... خۆ ئەم کارانە بەدەست ئێمە نین.

– پێدەچێ باوکم حەزی لە بوونی کوڕێکی دیش بووبێ!.

– لەوانەیە، بەڵام باشە مەبەستت لەم پرسیارانە چییە؟

– هیچ هەروا پرسیم.



لەو کاتەدا گریەیەك گەرووی گرتبووم لە بەردەمی دایکم چوومە دەرێ و ئەو بەسەرهاتەی حیکمەت بۆی گێڕابوومەوە بە ئەندازەیەك گیان و دڵ و دەروونی ئاڵۆز کردم دەمەویست لەم کۆمەڵە خێزانانەی کە تا هێشتا وەکو دەوری بەرد بیردەکەنەوە دوورکەومەوە و بچمە جێگایەك مرۆڤەکانی هێندە بیر تەسك نەبن.

لەو ڕۆژەوە تا ئیستاش هەر لەبیری ئەوە دام کە ئایا کچ بوون نەنگە؟ ئەگەر بەڕاستیش کچ بوون گوناهە ئۆباڵەکەی لەئەستۆی کێیە؟.

چونکە تۆ کوڕی بەختت هەیە و تکا دەکەم هەر ڕێگایەکی چارەسەریت دۆزیەوە بۆ ڕزگاری حیکمەت و کچانی وەکو ئەو بۆم بنووسە.

**لە دواییشدا داواکاری ساغیتم و چاوەڕوانی وەڵام**

**زەینەب یالکەر**

# تۆ هێشتا تێناگەی!..

ئەستەمبۆڵ 25ی کانوونی دووەمی 1967

زەینەب.

کاتێ نامەکەتم خوێندەوە لەلایەك پێکەنیم و لەلایەکی ترەوە زۆر سەغڵەت بووم. زۆرم غەمی ئاواڵەکەت بوو. سەرەنجامی حیکمەت و بەسەرهاتی ژیانی باوك و دایکیم بۆ بنووسە بزانم لە دواییدا کاریان گەیشتە کوێ. من تا ئێستا بەبیرمدا نەهاتووە کە کچ یا کوڕ بوون ئە ئاوا کار بکاتە سەرچارەنووس و ژیانی خێزانێك. ئەم باسەم لە باوکم پرسی لە دوای قسە و باسێکی دوور و درێژ گوتی:

((ئادەمیزاد کە دێتە دنیاوە یا نێرە یا مێ. جا چ جیاوازییەکی هەیە ئەگەر مێ بێ یا نێر..؟))

پرسیم:

– باوکە تۆ پێت خۆش بوو ژن بای؟.

یەکسەر تێکڕا بوو و بە تووڕەییەوە وەڵامی دامەوە:

– لەبەر چی!.

وەکو بڵێی ژنایەتی تاوانێك بێت! باوکم تا بڵێی سەغڵەت بوو. لەدواییدا هەمان ئەو پرسیارەم لە دایکم کرد:

– دایە پێت خۆش بوو پیاو بای؟.



دایکم هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەڵامی دامەوە:

– بەداخەوە! خۆزگە پیاو بامایە.

دوێنێ مامۆستا بردینییە سەیری مۆزەخانە، کاتی گەڕانەوە هەمان پرسیاریشم لەو کردەوە.

مامۆستا پێکەنی و پرسی:

– ئەمەت چۆن بە بیردا هات؟

بە کورتی بەسەرهاتی نامەکەی تۆم بۆ گێڕایەوە.. لەسەرخۆ دەستێکی بەشانمدادا و گوتی:

– ئەم مەسەلانە لەگەڵ تەمەنی تۆدا ناگونجێن!.

مامۆستا وا تێدەگا ئێمە منداڵین و هیچ تێناگەین.

ڕۆژێکیش براکەم باسێکی لە باوکم پرسی ئەویش هەر ئەو قسەیەی کردەوە:

– ((تۆ هێشتا منداڵی تێناگەی... کەی گەورە بوویت تێدەگەی..))

هەر باوکم ئەمەی گوت براکەم وەڵامی دایەوە:

((باشە کەمن تێناگەم، تۆ تێمی بگەیەنە))

لەگەڵ ئەوەشدا کە ماوەیەك بەسەر ئەم پێشهاتەدا تێپەڕیوە ئێستاش هەر کاتێ باوکم وەڵامی براکەمی وەبیر دێتەوە پێدەکەنێ.

باشە بۆچی پێمان ناڵێن و بۆ نایانەوێ مەبەستەکانمان بۆ ڕوون کەنەوەو و تەنیا هەر دەڵێن: ((ئێوە هێشتا تێناگەن)) ئەوجا با من داستانێکی خۆش و بە تامت بۆ بگێڕمەوە.

چەند ڕۆژێك لەمەو پێش دایکم برایەکەمی هەڵگرتبوو و چووبووە ماڵی دراوسێیەك. ژنانی دراوسێ لەوێ خڕ دەبنەوە و گۆنگەڵێ دەبەستن و خەریکی قسان دەبن، ژنێکی ئاوسیشمان دەنێودا دەبێ کە ورگی لەسەر زاری دەبێ. ژنەکان دەستدەکەن بە قسەو باس دەربارەی کارو ئەرکی تایبەتی ژنان.

براکەم لە سوچێکی ژوورەکەدا بەتەنیا یاریدەکات و هیچ ئاگای لە قسەکانی ئەوان نابێ و سەرقاڵی یاریی خۆی دەبێ، بەڵام کاتێ کە ژنێکیان دەڵێ:

– ((ئەم جۆرە قسانە لەلای منداڵان مەکەن)) برایەکەم وشت دەبێتەوەو دەست لە یارییەکەی هەڵدەگرێ و گوێ بۆ قسەکانیان هەڵدەخا. ژنێکی تریان دەڵێ:

– ((بابە ئەو هێشتا منداڵە. هیچ لەم قسانە تێناگات!.))

بەم قسانە هەستی خۆتێهەڵقورتاندنی برایەکەم دەجووڵێت و هەوڵدەدا لە قسەکانیان بگات، خۆی گێل دەکات وا پێشان دەدا سەرقاڵی یارییە، بەڵام تەواوی هەست و هۆشی لای قسەی ژنەکان دەبێ، هەر شتێکی کە دەیڵێن تێیدەگات و لە هەلێك دەگەڕێ تا بیسەڵمێنێ کە ئەو شتانەی بیستوویەتی تێشیان گەیشتووە. بەتایبەتی دەیوست گەورەتران تێبگەیەنێ کە منداڵانیش باش لەشتان دەگەن.

پێرێ شەوێ دراوسێکان هاتبوونە ماڵی ئێمەو ژنە ئاوسەکەشیان دەگەڵدا بوو. برایەکەم یەکەودەردوو چووە پێشی و گوتی:

– ((پورێ زگت پڕە.. وەنا ؟))

لەپێشدا ژنەکان هەموو بێدەنگ بوون، دوایی لەپڕ دەستیان کرد بە پێکەنین، ژنە ئاوسەکە وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ ڕۆڵەگیان.



برایەکەم بێ ئەوەی بسڵەمێتەوە پرسی:

– حەزت لێیە منداڵت ببێ، وەنا ؟

دایکم و باوکم تەماشایەکی یەکتریان کرد. لەبەر ئەوەی برایەکەم دەیویست بیسەڵمێنی کە گەورە بووەو ئیدی منداڵ نییە و تێدەگات گوتی:

– من دەزانم ژن چۆن زگیان پڕ دەبێ!.

ژنەکان لە شەرمان لێوی خۆیان گەست! و پیاوەکانیش بۆ ئەوەی قسەکە بگۆڕن شتی جۆراو جۆریان هێنایە ناوەوە، بەڵام برایەکەم دەستبەردار نەبوو و هەر دەیویست بیسەڵمێنێ کە ((من تێدەگەم)).

دایکم گوتی:

– لە سەری مەڕۆ کوڕە.. بێدەنگ بە!

بەڵام برایەکەم هێشتا هەر وازی نەدەهێنا. هێندەی نەمابوو میوانەکان ببسێن لە کەنوان، هەرچییەکیان دەکرد خۆیان بۆ ڕانەدەگیرا. دایکم برایەکەمی گرت و بردیە دەرەوە. برایەکەم کە پیشی خواردبۆوە بەدەم کوڵی گریانەوە قیژاندی:

– من هیچم نەکردووە. دەمەوێ بڵێم هەموو شتێك تێدەگەم.

کاتێ دایکم بردییە ژوورەکەی تەنیشتێ و لەوێی ئاخنی ئەم هەر هاتەوە ناو میوانەکان. مێردی ژنە ئاوسەکە گووتی:

– منداڵی ئەم زەمانە دەڵێی شەیتانن سەر لە هەموو شتێکی دەردەکەن.

ڕاستت دەوێ من ئەم کارەی براکەمم زۆر پێخۆش بوو و بەتەواوی لەگەڵ ئەودا بووم، و کە گەورەکانیش دەڵێن منداڵان هیچ تێناگەن زۆرم پێناخۆشە و پێشی سەغڵەت دەبم.





گۆڤارێك كە وێنەی ژنێكی كاتی سەما كردنێی لەسەر چاپ كرابوو هێنام پێشانی باوكمم دا و گوتم:

– بابە پیاو بۆ سەما ناكەن؟

باوكم تەماشایەكی سەرتاپایی كردم و، وەڵامی دامەوە:

– ئەمجارە نۆرەی ئەمەیە!

یەكێ لە ئاواڵەكانی باوكم بۆ ڕازیكردنی من و لەبەر دڵی من گوتی:

– سەما ئیشی پیاو نییە. ئیشی ژنانە.

بێ ئەوەی بەسەرخۆمی بێنم یەكسەر وەڵامم دایەوە:

لەم سەردەمەدا جیاوازی لەنێوان ژن و پیاواندا نییە.

یەكێكی دی لە ئاواڵەكانی باوكم گوتی:

– با، جیاوازییەكی كەم هەیە، ئەوە نییە بۆ ژنان ((ئەنجوومەنی پاراستنی مافی ئافرەتان)) دادەمەزرێنن و بۆ پیاوان ئەم جۆرە ئەنجومەنانە نین!.

باوكیشم بەدوای قسەی ئاواڵەكەیدا گوتی:

– بەڵێ... پیاو پیاوە و... ژن ژنە. هەر چۆنێ بێ جیاوازییەكییان هەر هەیە.

دایكم كە ئەم قسەیەی زۆر پێناخۆش بوو بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

– جیاوازییەكی گەورەشیان هەیە.. پیاو دەتوانێ تا بەیانی لە كۆڵانان بگەڕێ بەڵام ئەگەر ژنێك لە سەعات حەوت و هەشت درەنگتر بێتەوە ماڵێ، مێردەكەی پەڵپ و بیانووی وای پێدەگرێ كە نەخوا قبوڵێەتی و نە پێغەمبەر، باوكم و دایكم لێیان بوو بە دەمەقاڵێ، ئاواڵەكانی باوكم لایەنی باوكم و



ژنەكانیشیان لایەنی دایكمیان گرت، هێندەی نەمابوو میوانییەكە ببێتە گۆڕەپانی جەنگ.

بە كورتی ئەو پرسیارەی كردبووت یەخەگیری هەمووانە، و لەناو هەموو خێزانێكدا جیاوازی دەخەنە نێوان كور و كچانەوە.

من وا هەست دەكەم كە ژن لەلای خۆیەوەو پیاویش لەلای خۆیەوە پێكەوە دەتوانن زۆر شت وەدەست بێنن، لەمێژووشدا زۆر ژن هەن كە هەرگیز نایانەوێ پیاو هەر هەبن.

لەژیانا گرینگ ئەمەیە كە ئادەمیزاد بەخۆی قایل بێت و ئەو كەسە بەختەوەری ڕاستەقینەیە كە بەوەی هەیەتی یان بەوەی لە ئارادایە، بەتەواوەتی قایل بێت و قنیاتێ بكات.

لە دڵ و گیانەوە ئارەزووی سەركەتنت دەكەم و چاوەڕێی نامەتم.

**ئەحمەد تاباری**

# ئێسقانی پاژنە

ئەستەمبۆڵ 30ی کانوونی دووەمی 1967

خوشکم زەینەب.

چونکە وا ڕاهاتووم هەموو هەفتەیەك نامەیەکی تۆ وەرگرم ئەمجاریان کە نامەکەت دواکەتووە زۆر سەغڵەتم و هەر چاوە چاومە.

هەموو ڕۆژێ دوای نیوەڕۆیان کە لە قوتابخانە هاتوومەوە لە دایکم پرسیوە:

((هیچ نامەم بۆ نەهاتووە دایکە؟)). کە زانیومە نەهاتووە زۆر پەست بوو وم لەبەر ئەوە پێش ئەوەی وەڵامی نامەم بێتەوە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم. بەیانی ئەو ڕۆژەی کە نامەی پێشووتانم خستە پۆستەوە وانەی زانیاریمان هەبوو لەنیوەی دەرسێدا بەڕێوەبەری قوتابخانە لەگەڵ یەکێکی دیدا هاتنە پۆلەوە، دوای ئەوەی کە بەڕێوەبەر ماوەیەك لەگەڵ مامۆستاکەماندا دوا، ((ئۆغز))ی هەستاندە سەر تەختە. تۆ ئۆغز نا ناسیت. ئەو تازە ئەمساڵ هاتۆتە قوتابخانەکەی ئێمە. لەپێشدا لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ئەناتۆڵی دەیخوێند لە دواییدا هاتە ئەستەمبۆڵ، یەکەم ڕۆژ کە هاتە قوتابخانەکەمان هەموو منداڵەکان هەر کە چاویان پێی کەوت یەکسەر دەستیان بە پێکەنین کرد.

دەزانی بۆ؟ لەبەر ئەوەی سەرو سەکوتی ڕاست دەتگوت پشیلەیە. زمانیشی زۆر دەیگرت. لەپێشدا منداڵەکان زۆریان ئازار دەدا بەڵام ئەو هیچ تووڕە نەدەبوو و وەك لەگەڵ ئەم شتانەدا ڕاهاتبێ. بەوانەی گاڵتەشیان پێ دەکرد زەردەیەکی دەکردو دەڕۆیی. منداڵەکانیش کە دیتیان ناتوانن تووڕەیکەن وازیان لێ هێنا.



(ئۆغز) زۆری باوەڕ بە خۆی بوو و زۆریش لەخۆی دڵنیابوو، هەر بۆیە هیچ کەسێکی لە کیسەیدا نەدەهێشتەوە! ڕۆژێك کاتی پشوودانێ لە حەسارێ یاریم دەکرد گوتی:

((منداڵینە کێ پێشبڕکێی دارەوانیەم لەگەڵدا دەکات؟))

ئەو بەستەزمانە هێندە پڕو هەڵچووبوو قسەکانی بەچاکی بۆ نەدەکران، کاتێ بە هەزار ناڵی عەلی لە مەبەستەکەی تێگەیشتن، منداڵەکان منیان پاڵ پێوەنایە پێشێ. بەڵام من ئامادە نەبووم پێشبڕکێی دەگەڵدا بکەم و لەدواییدا تێگەیشتم کە کارێکی باشم کردووە، کەمن نەچوومە پێشەوە جەنگیز خۆی ڕەپێش کردو دەستی بە گاڵتە پێکردنێی کرد:

- تۆ ناتوانیت دوو وشان بە باشی قسە بکەیت دەتەوێ بۆڕ بۆڕێن لەگەڵ ئێمەدا بکەیت؟!. منداڵەکان بەم مەتەڵەکە بە دەنگێکی بەرزەوە پێکەنین. لەبەردەمی شوێنی ئاو خواردنەوەکەدا داربەڕوویەکی گەورە هەبوو چەند مەترێك لەولا درەختەکەوە بە بزمارێك خەتیان کێشا. ئۆغز و جەنگیز لەسەر خەتەکە وەستان. من کرابووم بە ناوبژیوان (حەکەم) بە دەنگی بەرز هاوارم کرد:

((ئامادەن.. یەك.. دوو.. سێ..))

لەگەڵ گوتنی وشەی سێ هەردووکیان وەك تێسکەی تفەنگێ لەجێی خۆیانەوە دەرپەڕین و ڕووەو درەختەکە خۆیان کوتا. جەنگیز هێشتا نەگەیبووە درەختەکە ئۆغز گەیبە ترۆپکی سەرێ. لەو سەرەوە بەزمانە پەڵتەکەیەوە دەستی بە گاڵتە پێکردنێ جەنگیزی کرد، کەس بە باشی تێنەدەگەیی و بەزەحمەت زانیمان کە بە جەنگیزی دەگوت: ((ئاگاداربە نەکەوی!)).

لەدواییدا جەنگیزیش بەزەحمەت سەرکەوتە سەر درەختەکە، بەڵام نەیتوانی بچێتە تۆقەڵەکەی چاوی ڕێشکەو پێشکەیان دەکرد. ئۆغز وەك پشیلە لەسەر





درەختەکەوە هاتە خوارتر لای جەنگیزو دواییش وەك ماسییە بەرەو خوارخزی و بەفیزو ئیفادەیەکی زۆرەوە بە هەمووانی گوت:

((ئەوەی مەردی مەیدانێیە بێتە پێشێ))

ئیدی لەوێ ڕۆژێوە ئۆغز لەبەر چاوی ئێمە بووە پیاوێکی گەورە. کاتی گەڕانەوەی ماڵەوە کە بە ژێر دارسنەوبەرو سەروەکاندا تێدەپەڕین پێیاندا هەڵدەگەڕاو دەهاتەوە خوارێ.

ئۆغز و مینا لەسەر یەك مێز دادەنیشتن و بەم ئاواڵە زیرەکەی زۆر خۆشحاڵە.

ئۆغز دوو ڕۆژان دیار نەبوو. دیاربوو نەخۆش کەوتبوو، کە هاتەوە قوتابخانە مینا گوتی:

((منداڵینە دەزانن ئۆغز بۆچی زمانی لەنگە؟)).

بە پەرۆشەوە پرسیم:

((بۆ؟.))

((چونکە بە منداڵی باوکی زۆری لێدەدا. بۆ ئەوەی لە دەستی دەرباز بێت ڕایدەکردو دەچووە سەر دارێکی، هەر بۆیەش دارەوانیەش چاك فێربووە)).

چونکە زۆریش لە باوکی ترساوە بۆیە زمانی وا لاڵ بووە. ماڵ بۆ خۆی نەبوو میوانیش ڕووی تێکرد، ئۆغز خۆی لە خۆیەوە زمانی نەبوو بۆ بەدبەختیش جەنابی بەڕێوەبەریش ئەو ڕۆژە بانگی کردە سەر تەختە، سێ تابلۆ بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوون، یەکێکیان پەیکەرێ بوو، گەدەو دڵ و کۆئەندامی هەرسی پێشاندەدا. دووەمیشیان کۆمەڵەی ڕەگ بوو. سێهەمیش پەیکەری ئێسقانەکانی پێشاندەدا، ئەوەی لەگەڵ بەڕێوەبەریش بوو دیار بوو کە سەرپەرشتیارە. پەنجەی بۆ تابلۆی پەیکەری ئێسقانەکان کێشا و لە ئۆغزی پرسی:



((ناوی ئەم ئێسقانە چییە؟))

ئۆغز بێدەنگ بوو.. سەرپەرشتیار دووبارە پرسییەوە:

((ئەم ئێسقانە چییە؟))

مینا بە ئاماژە تێیگەیاند کە ((ئێسقانی پاژنە)) یە.

ئۆغز چەند جارێکانی گوت:

((پ.. پا.. پا.. پاژنە.. پا.. پا.. پاژنە))

سەرپەرشتیار ئێسقانێکی دیکەی پێشانداو پرسی:

((ئەی ئەمە چییە؟))

ئۆغز وایزانی ئەوەی پێشانی هەڵەکردووەو پاژنە ئەم ئێسقانەیانە کە سەرپەرشتیار خەریکە پێشانیدەدا، وەڵامی دایەوە:

((پا.. پا.. پاژنە..))

سەرپەرشتیار ئەژنۆی پێشان داو پرسی:

– ((باشە ئەمەیان چییە؟)).

ئۆغز کە زۆر تێکچوو بوو دیسانەوە وەڵامی دایەوە:

((پا.. پا.. پاژنە))

سەرپەرشتیار ئێسقانێکی لە ئێسقانەکانی گەردەمل پێشان دا و پرسی:

– ئەی ئەمە چیە؟.

ئۆغز دیسانەوە وەڵامی دایەوە پاژنە.

وەك تەواوی ئێسقانەكانی لەش ناویان پاژنە بێ. هەر لەسەرەتاوەش بۆ وەڵامدانەوە هێندەی تین لەخۆ كردبوو و زمانی وا لەنگ بوو بوو ئارەقەی بەسەرو ڕواندا دەهاتە خوارێ. سەرپەرشتیار لە تووڕەییاندا وەك ئۆغز بە زمانی لەنگەوە دەستی بە قسان كرد:

((ب.. باشە.. ئە.. ئەم.. ئەمە.. چی.. یە..!.))

ئۆغز دیسانەوە وەڵامی دایەوە ((پاژنە)).

سەرپەرشتیار نەیدەزانی چ وەڵامێكی ئۆغز بداتەوە قیژاندی:

– تۆ تەنیا هەر ئەم دوو وشەیە فێربوو وی برۆ لەبەرچاوم لاچۆ تەمبەڵی تەوەزەل.

ئۆغزی بێچارە هێندە نارەحەت بوو كە ئیدی لەبەیانییەوە نەهاتەوە قوتابخانە. ڕەفتاری بێ جێی سەرپەرشتیار بووە هۆی ئەوەی كە ئۆغزی بەستەزمان لە دەرس و پۆل ڕابكات. لەكاتێكدا ئەگەر سەرپەرشتیار لە ماڵی ئەو بگەیشتایە دوا ڕۆژی ژیانی ئەو وا تاریك نەدەبوو و كێ دەڵێ نەدەبووە بلیمەتێكی گەورە.

بەڵێ زەینەب ئەمە بوو، كە پێم حەیف بوو بۆت نەنووسم.

هەر بە گەیشتنی نامە وەڵامەكەی بنێرەرەوە، چونكە چاوەڕێم، نەكو خوانەخواستە نەخۆش كەوتبی.

**چاوەڕوانی وەڵامی خێرا**

**ئەحمەد تاباری**



## جەژنی لە دایكبوون

ئەنقەرە یەكەمی شوباتی 1967

لەوەی كە بەهۆی نەخۆشییەوە چەند ڕۆژێ نەمتوانی وەڵامی نامەكەت بدەمەوە زۆر داوای لێبوردن دەكەم. نەخۆشییەكەم هێندە گرنگ نەبوو. تۆزێكم سەرما بوو بوو. دەمتوانی وەڵامی نامەكەت بنووسمەوە بەڵام چونكە مەتینیش نەخۆش بوو و لەماڵەوە كەوتبوو نەیدەتوانی نامەكەت بەرێتە پۆستەخانە، نەشمویست بە دایكم و خوشكم بڵێم نامەكە بخەنە پۆستەوە.

ئەمڕۆ هاتمەوە سەرخۆم و چوومەوە قوتابخانە، دوای گەڕانەوەم لە قوتابخانە بڕیارم دا نامەت بۆ بنووسم. بەڵام دایكم بانگی كردم و گوتی:

((زەینەب نامەت بۆ هاتووە.)) تومەز ناو ونیشانەكەتی لەسەر زەرفەكە خوێندبۆوە، بە پێكەنینەوە درێژەی دایە: ((لە ئەحمەدەوە.. ئەو ئەحمەدە چ ئاواڵێكی باش و بە ئەمەكە كە لەبیرت ناكات.))

دوای خوێندنەوەی نامەكەت چوومە لای مەتین ئەو هێشتا نەهاتبۆوە سەرخۆی، تای لێیە. پلەی گەرمییم پێوا 38 سی و هەشت پلە بوو. هۆی نەخۆشی هەردووكمان كەمتەرخەمی خۆمان بوو. چەند شەوێ لەمەوپێش یەكێ لە هاوپۆلەكانمان كە ((ئاتامان)) ناوێكە جەژنی لە دایكبوونی گێڕاو لەوێ نەخۆش كەوتین. لەو قوتابییانەی كە چووبووینە ئەوێ سێ كەسمان نەخۆش كەوتین. دایكم لەگەڵ دایكی ((ئاتامان)) دا لە كۆبوونەوەی ئەنجوومەنی دایكان و مامۆستایانی قوتابخانەدا پێك ئاشنا بوو بوون و ئێمەی بۆ جەژنی لە





دایکبوونی کوڕەکەی بانگ کردبوو. ناو ونیشانی ماڵی ئێمەی لە دایکم وەرگرتبوو و پێی گوتبوو:

((بە ئۆتۆمبێل دێم بە دوایاندا و دەیانبەم)) دایکم وەڵامی دابۆوە ((زەحمەت مەکێشە خۆم منداڵەکان دەنێرم)).

دایکم و باوکیشمی بۆ هاوبەشی ئەو جەژنە بانگ کردبوو.

سەرەنجام دوای پێداگرتنێکی زۆر دایکم قایل بوو بەڵام باوکم هەر قایل نەدەبوو بێن. دەیگوت:

((جەژنی لەدایکبوونی منداڵانە ئێمە بۆ بچین))

دایکم بەر پەرچی دایەوەو گوتی:

من و مەتین هەریەکەو دیارییەکمان بۆ کڕین. من کتێبێك و ئەویش پاندانێك. دوای نیوەڕۆ بە ئۆتۆمبێلەوە هاتن بە دواماندا، باوکم لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا لەگەڵ باوکی ((ئاتامان))دا پێك ئاشنا بوون. ئۆتۆمبێلەکەیان زۆر شیك و جوان بوو.

لەوانەیە بلێی پاشە ملە باسی خەڵکی دەکەم و پێت ناخۆش بێت، بەڵام بڕوا بکە جگە لەوەی کە دیومە بێ کەم و زیاد باسی هیچ شتێکی دی ناکەم.

سامانی بێ شوماری ((ئاتامان))ەکان هەر لە یەکەم سەرنجەوە بەرچاو دەکەوێ بەڵام یەك دەنك سەلیقە چییە نیانە.. شتوومەکی بەنرخیان وەك دوکانی بەقاڵ پەرت و بڵاو و نارێك لەناو ژوورەکاندا بەسەریەکدا کەوتوون. لە هەمووشی سەیرتر قسەکردنی باوکی ((ئاتامان)) بوو. هەر قسەیەکی بکردبایە بە ((بەندە)) دەستی پێدەکردو بە بەرامبەرەکەشی دەگوت ((جەنابتان)).



ئێمە نزیکەی پازدە منداڵ دەبووین بەڵام سی چل کەس میوانی گەورەش لەو جەژنی لەدایکبوونەدا هاوبەش بوون! مەتین بە دایکمی گوت: ((دەڵێی جەژنی لە دایکبوونی باوکی (ئاتامان)ە؟!))

دایکم خووی وابوو ئەگەر یەکێکمان پرسیارێکی بکردبایە یا قسەیەکی بێ مانای لەدەم ترازابایە نوقورچێکی لێدەگرت.. ئەمجارەش نوقورچێکی وای لە مەتینی بێچارە گرت گوتم گۆشتی لێ پچڕیوە! مەتینی بەستەزمان جووکەی لێوە نەهات و ئازارەکەی کێشا.

دایکی ئاتامان بە دایکمی گوت:

لەماڵەوە جێگامان کەم بوو نەمانتوانی هەمووان بانگ کەین. خوا نەیبڕێ دۆست و ناسیاویش زۆرن ئەگەر بانگیان نەکەی دەرەنجێن بەمێردەکەمم گوتووە ساڵی ئاینده ئاهەنگی جەژنی لە دایکبوونی منداڵەکان لە یەکێ لە ئوتێلە گەورەکاندا بگێڕن... مێردەکەم پیاوێکی چاکە خوا ئاگای لێی بێ هەرگیز قسەم لە قسەیدا ناکات. دوایی لە دایکمی پرسی:

– مێردەکەی ئێوە چۆنە؟ گوێ لە مشتە یا سەرووەشێن؟

دایکی ئاتامان بە دەنگێکی بەرزەوە پێکەنی بەڵام دایکم ئەمەی زۆر پێناخۆش بوو، وەکو خۆی هەڵە بکا وەڵامی دایەوە:

– مێردی کێ؟ مێردی من؟

– بەڵێ گیانەکەم مەبەستم مێردەکەی ئێوەیە!. دەڵێم ئەویش وەکو هینەکەی من گوێ لە مشتە؟.

چونکە دایکم ئەم باسەی لێ خۆش نەدەهات بۆیە ویستی قسەکە بگۆڕێ، گوتی:

– دەڵێی ژوورەکە زۆر گەرمە؟.

– بەڵێ چونکە جەژنی لەدایکبوونی کوڕەکەم بوو ترسام سەرمای ببێ شۆفاژەکەم زۆر کردۆتەوە.

چونکە دایکی ئاتامان بە پێچەوانەی دایکی منەوە هەر دەیویست بێتەوە سەری دێڕێ و لەبارەی مێردەکەیەوەو لەو ڕووەی کە دەیداتێ بدوێن سەر لەنوێ بەبێ پێشەکی دەستی پێکردەوە:

– مێردەکەی من زۆر دەست و دڵ والاّیە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئیشێك ناکا. سێ سکرتێری کچی لای خۆی ڕاگرتووەو هەموو مانگێکیش دەیانگۆڕێ:
ئەمجارە هەروا بە دەم پێکەنینەوە لەسەری ڕۆیشت:

– خوشکێ ڕەگەزی پیاو ئەوهایە، خۆشیان لە دەورگێڕی چاویان هەر بەدوای ژنی دییەوەیە!

دایکم کە لە باسەکە یەکجار زۆر بێزار بوو بوو بەمن و مەتینی گوت:

– ئێوە بچنە لای باوکتان.

پیاوەکان لە هۆڵەکەدا کۆببوونەوە. سەرمێزەکان پڕ لە خواردنەوەو میوەو خواردن بوو، باوکم کە لەگەڵ باوکی ((ئاتامان))دا خەریکی قسان بوو هاتنی ئێمەی پێناخۆش بوو و گوتی:

– کوڕم بۆچی دایکتان بەجێهێشتووەو هاتوونە ئێرە؟

مەتین وەلاّمی دایەوە:

– خۆی ناردینی!

باوکی ئاتامان لە باوکمی پرسی:

– ئەمانە هی جەنابتانن؟

– بەڵێ



– خوا بۆ جەنابتیان بێڵێ. ببوورە چیم دەگوت؟ ها؟

بەندە هەرگیز مرۆڤی قرچۆکم خۆش ناوێت.

با بێینەوە سەر ژنی قرچۆك. ئاخ. بەخوا ژنان هەموویان هەر ڕژدو قرچۆکن. خۆ ژنەکەی من نازانی چ جوولەکەیەکە! لەبەر قرچۆکیان پرتەقاڵی ڕزیو و خراپ نەبێ نادا بەکارەکەرو بەردەستەکان. هەرچەندە دەڵێم: ئافرەت خوا هەڵناگرێ دەست لەم خووە خراپە هەڵگرە بەردەست و کارەکەریش با هەر لەوە بخۆن کە ئاغاو و ئاغاژن دەیخۆن، بەلاّم بۆ بەگوێیدا دەچێ!؟

ئەوە مرۆڤایەتی و پیاوەتی و ویژدانیش قیروسیا، پیاو دەبێ ئەمە بزانێ ئەگەر دە فلس پرتەقاڵت لە کارەکەرو بەردەستان چاو بێت ئەوە ئەوانیش قاپێکی شووشە یا چینییەك دەشکێنن کە دوو چەندانی پارەی ئەو میوەیە دێنێ. پیاو دەتوانێ چیان پێ بڵێ؟ دەڵێ لە دەستم بەربۆوەو شکا. یا دە ئەوەندەیت هەر لێ دەدزن، پیاو چووزانێ؟ خۆ ناتوانی شەو و ڕۆژ ئێشك بگری، بەلاّم کێ گوێی لێیە؟

باوکم پێی گوتین:

– دەی هەمووتان بچنەوە لای دایکتان.

ئێمەی لە خۆیان دوور خستەوە. چەند منداڵێکی دیش وەکو ئێمە ئاوا ئاوارەو سەرگەردان بوون. دەچوونە لای دایکیان دەیاننناردنەوە لای باوکیان. دەچوونەوە لای باوکیان دەیانناردنەوە لای دایکیان یەکێ لە دایکەکان کە لە هەراو هۆریای منداڵەکان تەقی کردبوو گوێم لێ بوو بەو ژنەی تەنیشتی دەگوت:

– لەگەڵ منداڵان قەت نەچییە چ جێیان هێندە هارو هاجییە دەکەن مرۆڤ لەخۆی وەڕەز دەبێ.

باوکم سەرێکی بە دیوەکەیدیدا گرت و بە سپایی بە دایکمی گوت:





چاك وایە بڕۆین.

دایکم وەڵامی دایەوە:

- نابێ جوان نییە با تاوێکی دیش دانیشین بزانین کار دەگاتە کوێ!

باوکی ئاتامان ڕۆژنامەیەکی بەدەستەوە بوو هاتە لای باوکم و گوتی:

- بەندە.. هە.. هە.. هە.. زۆر یارمەتی منداڵە هەژارەکان دەدەم. هەموو ساڵێ شەوی جەژن شتومەك و کەل و پەلێکی زۆر دەکڕم و بەسەریاندا دابەش دەکەم سەیری لە ڕۆژنامەشدا نوسیویانە. ئێمەی منداڵەکانیان هەموو بردنە ژوورێکەوە کە بۆ جەژن ئامادە کرابوو، هەموو ئەو دیارییانەی کە بۆ (ئاتامان)یان هێنابوو لەسەر مێزێکی گەورە لەناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕیزکرابوون. چونکە زۆر گەرما بوو پەنجەرەکانیان کردبۆوەو وا ڕێکەوت من و مەتین لای پەنجەرەیەکەوە وەستا بووین و لەوێ هەردووکمان سەرمامان بوو. ویستمان هەستین بڕۆین، باوکی ئاتامان نەیهێشت:

- بۆ کوێ؟ هێشتا نانی ئێوارەتان نەخواردووە، ڕاوەستن دوو سێ (پێك) هەڵدەم.

باوکم وەڵامی دایەوە:

- ئیشمان هەیە قوربان با لە خزمەت مەرەخەس بین.

کاتێ هاتینە دەرەوە دایکم تەماشایەکی باوکمی کرد دیتی زۆر سەغڵەتە گوتی:

زۆر داوای لێبوردن دەکەم. نەمزانی وای لێدێ. ئەو ژنە زۆری لەگەڵ کردم بەیانی ئەو ڕۆژە من پلەی (تا)م گەیشتە 39 سی و نۆ و مەتینیش نەخۆش کەوت.

لەنامەی پێشووتدا نوسیبووت هەرچی دەربارەی حیکمەت تێگەیشتووم بۆت بنووسم. هەفتەیەکە حیکمەت پێی نەناوەتە قوتابخانە نازانم چی بەسەرهاتووە.



کەسیش ماڵەکەیان نازانێ. چونکە ئەم ڕووداوە زۆری سەغڵەت کردووم و دڵنیام تۆش زۆرت مەراقی چارەنووسی ئەوە. تێدەکۆشم تا هەفتەی داهاتوو هەر چۆنێ بێ هەواڵێکی لێوە وە دەست بێنم و بۆتی بنووسم.

ئومێدەوارم تۆ وەك من وەڵامی نامە دوا نەخەی چاوەڕێی نامەتم

**زەینەب یالکەر**

# پەروەردەی بلیمەتێک

5ی شوباتی 1967

خوشکم زەینەب

هەمیشە چاکی و ساغی خۆت و برایەکەت لە خوا دەخوازم، لەو ئاوڕەش کە دایکت لێیدابوومەوە سوپاس گوزارم، تکایە سلاوی منی پێبگەیەنە.

ئاوالی خۆشەویست جەژنی لە دایکبوونی (ئاتامان)ت چەند جوان نویسبوو. ئایا دەزانی من تا ئێستا ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوونم نەگێڕاوە؟. لەناو خێزانی ئێمەدا ئەم هەیت و هووتە نییە. هەر بۆیەشە من لە جەژنی لەدایکبوونی کەسدا هاوبەشی ناکەم.

لە پشووی سەری سالی تازەدا لەگەل دایکمدا بە میوانی چووینە مالی یەکێك لە خزمەکانمان و سێ ڕۆژ لەوێ ماینەوە، یەکێك لەکچە هاوپۆلەکانی کچی خزمەکەمان جەژنی لەدایك بوونی بوو و ئێمەشیان بانگکرد. لەو ڕۆژە بەدواوە دوو شت لە مێشکی مندا مانەوە کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە. یەکێك لەمانە منداڵێکی شەیتان بوو کە تەواو ماڵەکەی ژێرەو ژوور کردو هارەبانییەك نەما نەیکا! لەپڕ بیستمان لە ئاودەستخانەوە هاوار هەڵساو بەمستەکۆڵەو شەق و پێلەقە وا لەدەرگاکەی دەدەن هێندەی نەماوە لە گرێژەنە چێ. هەموو میوانەکان بەرەو ئاودەستخانەکە ڕایانکرد، دیاربوو کە ئەو منداڵە شەیتانە دەرگاکەی لەسەر یەکێ لە میوانە ژنەکان داخستووەو لەسەریشی قفل داوەو لەوێی داکردووە!



منداڵەکە خۆشی دیار نەبوو، خاوەن ماڵ و ژنەکەی و کچەکەی کەوتنە گەڕانی ژوورەکان بۆ دۆزینەوەی کلیلی دەرگای دووەمی ئاو دەستخانەکە...

میوانەکان لە پێکەنینا خەریك بوو بپسێن و حەپسی ناو ئاودەستخانەکەش بە لەقەو مستەکۆڵە هەر خەریکی کوتانی دەرگاکە بوو!

پیاوێکی قەڵەوە کە لە پێکەنینا چاوی پڕ بوو بوو لە ئاو گوتی:

– ئەمە هەبێ و نەبێ ئیشی کوڕەکەی منە. هەر ئەوە ئەم ناجسنیەی کردووە. کوا لە کوێیە تا گۆڕی بابی دەرێنم!

کوڕەکەمان نەدۆزییەوە. بەڵام کابرا هێشتا هەروا خەریك بوو دەربارەی چاکەو پیاوەتی کوڕەکەی دەدوا:

– ماشاڵڵا زۆر وریایە.. یەك دەقیقە وەستانی نییە. هەموو ئیشەکانیشی ئاوا خۆش و مەزەدارن! ؟؟.

ژنە بێچارە لەناو ئاودەستخانەکەدا هاواری دەکرد و باوکی منداڵەکەش دەربارەی شیرین کارییەکانی کوڕەکەی کۆنگرەی گرتبوو و دەیگوت:

– خۆشم بە منداڵی هەر وا بووم! سەگبابە بەخۆم دەچێ!

زۆر زرینگیشە ئاواڵەکانی بیست و چوار سەعاتە دەخوێننەوەو تێدەکۆشن کەچی ئەم هەرگیز گوێش ناداتێ و هەموو ساڵێکیش وەکو ئاو پۆلێك دەبڕێ. سەگبابە تا بڵێی زیرەك و وریایە. منیش ئەو کەسانەم خۆش ناوێن کە کاری سەربەخۆیانە دەکەن.

ئەوە ماڵ و ژن و منداڵەکانی هەموو لە ژوورەکاندا بە دوای کلیلەکەدا دەگەڕان کەچی کابرا، هەرلێڵیش نەدەبوو و لەسەرخۆ دەیگوت:

– ژێر چەرپایەکە بگەڕێن کوڕی من فێرە خۆی لەبن چەرپایاندا مات دەکا!. خاوەن ماڵەکە چوو ژێر چەرپایەکە بگەڕێ. ترق شتێکی بەسەردا





بەربۆوە کە هەستایەوە تەماشای کرد کلیلەکەیە. دوا بە دوای ئەوە منداڵەکە لەپشت کۆمەدیەکەوە گرم بازیدایە سەر چەرپایەکە!.

کابرای قەڵەو دایە قاقای پێکەنین:

– دیتتان!. نەمگوت ئیشی کوڕەکەی منە. ئەم شەیتانییەشی هەر لەزیرەکییەوەیەتی.

ئەو ڕۆژە منداڵە دەستی بە هەموان ڕاگەیی. و هێندەی نەمابوو دانیشتنی خۆشی و پێکەنین بکاتە شەڕو هەراو تێك هەڵدان!.

شتەکەی ترم کە لەبیر ناچێتەوە کرداری منداڵێکی دی بوو کە ئاواڵی کچی خزمەکەمان پێی ناساندم. منداڵێکی لاوازو ڕەنگ پەڕیوە بوو. چاوێکیشی خێل بوو. تەوقەم لەگەڵدا کردو ناویم لێپرسی. وەڵامی نەدایەوە. وامزانی کەڕیشە. بەدەنگێکی بەرزترەوە پرسیارەکەم دووپات کردەوە. وەکو یەکێك بییەوێ باسی شتێکی گرنگ بکات تاوێکی بیرکردەوە ئینجا ناوی خۆی گوت:

پرسیم: لەپۆلی چەندی؟

دیسانەوە تاوێکی دیکەی بیرکردەوە ئینجا وەڵامی دایەوە.. ها. وەکو ڕاهاتبێ هەر قسەیەك بکات دەربارەی قسەکە بیر بکاتەوە! زۆرم لێ ناخۆش هات. چووم بە کچە خزمەکانم گوت دەڵێی ئەم منداڵە تەواو نییە؟

کچە پێکەنی و وەڵامی دایەوە:

– کوڕە نا تەواوی چی؟ باوکی بەتایبەتی وای بارهێناوەو وای پەروەردە کردووە!

کچێکی دیش کە بەتەك ئێمەوە وەستابوو گوتی:

– لە قوتابخانە پێیدەڵێن ((شەش دانە)). ئەو تەنانەت لە کاتی وەڵامدانەوەی دەرسیش لەسەر هەموو ووشەیەك تاوێ ڕادەوستێ و بیر



دەکاتەوە. ئەمە نیشانەی پەروەردەی بەرزو ڕاستی ئەوە! باوکی لەو باوەڕەیە ((گەورە پیاوان دەبێ لەپێشدا بیر بکەنەوە ئەوجا قسە بکەن!)).

کچەکان خۆشیان بەمە پێکەنین گرتنی.. کچە خزمەکەمان گوتی:

– باوکی زۆر ژیرو دانایە! ماوەیەکی زۆری لەسەر ژیانی بلیمەت و گەورە پیاوان خوێندۆتەوەو پەی بەوە بردووە کە پیاوی بلیمەت چۆن پەروەردە دەکرێ و پێدەگا، ئێستا ئەویش خەریکە کوڕەکەی خۆی بلیمەتانە پەروەردە دەکات! تومەز واتێگەیشتووە کە گەورە پیاوان و بلیمەتەکان زۆر درەنگ ژن دێنن، بۆیە خۆشی ماوەیەکی زۆر هەر ڕەبەن بووە تا تەمەنی خۆیداوە لە پەنجا ساڵی ئینجا ژنی هێناوە، تەنها بۆ ئەوەی کوڕەکەی بلیمەتانە هەڵکەوێ.

پرسیم:

– ئێوە ئەمانە لەکوێ دەزانن؟ منداڵەکە خۆی پێی گوتوون؟.

هەموو خەڵکی شار لەم باسە ئاگادارن.. ئێمەش لەوانمان بیستووە! نەك هەر ئەمە بەڵکە چونکو زۆربەی بلیمەتەکان لاوازو باریکن، باوکەکە زۆر بە وردی ئاگادارە، نایەڵێ کوڕەکەی خواردنی تەواو بخوات تا لەش و لاری بلیمەتانە هەڵکەوێ.

سەروەختێك هێندە لەڕو لاواز ببوو زۆر نەمابوو بمرێ!

پرسیم: ئەی چاوی بەچی خێڵ بووە؟.

– چونکە لە منداڵییەوە دەست بە پەروەردەی بلیمەتانەی دەکەن، باوکی نایەڵێ دایکی تێر شیری کات، هەر لەو کاتەوە ئەم منداڵە لەڕو مردەڵۆخ هەڵکەوتووە، ڕۆژێك لەبەر لاوازی و بێ حاڵی لەناو لانکەی بەردەبێتەوەو چاوی خێڵ دەبێ.. باوکە لەجیاتی ئەوەی کە سەغڵەت بێ زۆر خۆشحاڵ دەبێت، چونکە یەکێ لە نووسەرە گەورەکان چاوی خێل بووە!

ئێستاش یەکێ لە ئارەزووە هەرە گەورەکانی باوکەکە ئەمەیە کە منداڵەکەی کورتە باڵا بێت. چونکە لە کتێباندا خوێندوویەتییەوە کە زۆربەی بلیمەتەکان کورتە باڵا بوو ون!.

ئەوەی ئێستا تێدەگەم بۆ ئەو دەمەی ناوەکەیم پرسی هەڵوێستەی کرد. بەڵام بەلای منەوە هەموو شتێك بە پێچەوانەی ئەمەوەیەو ئەم منداڵە لەبەر کەم خۆراکی بیرومێشکی هێندە لاوازو سست بووە کە تەنانەت ئەگەر بیرنەکاتەوە ناوی خۆشی لەبیر دەچێتەوە.

لە حیکمەتت پرسیبوو. تا ئێستاش گۆڕی هەر ونە. نازانم بەستەزمانە چی بەسەرهاتووە. دڵنیابە هەر سوسەیەکی پەیدابێ بۆت دەنووسم، ئێستاش ئەوە دەچمە دەرێ و نامەکەت دەخەمە پۆستەوە. دواییش دەگەڕێمەوە ماڵێ و پێویستیەکانی قوتابخانەم ئامادە دەکەم.

دەستی چەپەم کوتاوەو و زۆرم دێشێ و ناتوانم بیجوولێنم.

ساغی و بەختیاریت لە خوا دەخوازم.

**هەر سەرکەوتوو بی زەینەب گیان**

**ئەحمەد تاربای**



## کچی نارێک و پێک

ئەنقەرە 10ی شوباتی 1967

برام ئەحمەد، پێش هەموو شتێك با هەواڵێکی حیکمەتت پێڕابگەیەنم کە تازەم وەدەست کەوتووە. حیکمەت دوێنێ هاتەوە قوتابخانە. دایك و باوکی پێکهاتوونەتەوەو لەم ڕووەوە زۆر شادو شەنگوڵە. شتێکی دیش هەیە دەمەوێ پێت بڵێم. ئەو نامانەی کە تۆ بۆم دەنێری هەموویان کۆ دەکەمەوە.. پێشان نامەکانم بە پەرت و بڵاوی لە سوچێکاو لێرەو لەوێ فڕێدەدان. بەڵام چەند ڕۆژێ لەمەوپێش هەموویانم ڕێکخست و بەگوێرەی بەرواریییەکانیان خستمنە ناو دۆسیەیەکەوە.

وا نەزانی مرۆڤێکی هێندە بە هۆش و گۆشم یا ئەوەندە بێ ئیشم لە بێ ئیشیاندا ئەمەم کردبێ، نە، بە هیچ جۆرێك. بەڵکو ڕووداوێك پێشهات کە ناچار بووم ببمە ئەم کچە ڕێکوپێکە. لە ماڵەوە هەموو ناویان ناوم تەمبەڵ خان، خوشکم، دایکم، باوکم، لەبێ سەروپایی و پەرت و بڵاوی کارەکانمەوە هەر هاوارو گلەییان بوو... لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆم نەمدەویست ئەوها نارێك و پێك بم بەڵام لەوەش زیاترم لەدەست نەدەهات.

بەیانیان دەبوایە دوو سێ سەعاتان بە دوای کتێب و دەفتەرەکانمدا بگەڕێم و هەریەکەیان لە کون و قوژبنێکیدا بدۆزمەوە.

دایکم زۆری غەم پێ دەخواردم و هەمیشە سەرزەنشتی دەکردم:

– قورپەسەر ئەو ماڵەی تۆی دەچیەی؟!





منیش وەڵامم دەدایەوە:

چی بکەم وا دروست بوو وم.

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر ئەم باسە سەر لەنوێ هەڵیدایەوە.. هەر چەند دەگەڕام کتێب و دەفتەرەکانم نەدەدۆزینەوە باوکم دەستی بە بۆڵە بۆڵێ کرد، باپیرو نەنکیشم لەماڵی ئێمە بوون ئەوانیش لەبێ سەروبەری و نارێك و پێکییە من وەزاڵە هاتبوون. تەنانەت خوشکیشم خۆی تێکەڵ کردو دەستی بە ئامۆژگاری کردنی من کرد:

– کچ نابێ هێندە بێ سەرو بەرو بێ دەست و پابێ!.

هێندەیان لێ بێزار ببووم دەمویست کۆمەدییەکەم لە پەنجەرەیڕا فڕێدەمە حەسارێ. بەڵام کاتێ پەرداغێکم ئاو خواردەوەو هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا تەواوی تووڕەییەکەم ڕەویەوەو تێگەیشتم ئەوان ڕاستن، ئیدی بڕیارمدا دوایی بەم حاڵە بێنم و ببمە کچێکی ڕێك و پێك. دەستبەجێ تەواوی کەل و پەلی کۆمەدییەکەم هەڵڕشتە دەرێ تا سەر لەنوێ هەموویان بە ڕێکی کۆ بکەمەوەو هەر شتەی لەجێی خۆیدا دابنێمەوە.

کاتێ کتێبەکانم هێنانە دەرێ جووتێك گۆرەویی پیاوانە.. قەڵەمێکی لێوان و دووکارتم لەناو کتێبەکاندا دۆزییەوە. هەموویانم بردنە ژووری میوانان. باس هەمان باسی گۆڕین بوو. ئەوان هێشتا هەر لەبارەی بێ سەروپایی منەوە دەدوان.. گۆرەوییەکانم پێشاندان و پرسیم:

ئەمە هی کێیە؟.

باوکم هاواری کرد:

– هی منە.. ئەمە لە کوێ بوو؟ پێرێ دوو سەعاتی بە دوادا گەڕام نەمدیتەوە.



– لەناو کتێبەکانی مندا بوو!

دوای ماتیکەکە (قەڵەمی لێو)ەکەم هەڵبڕی و پرسیم:

– ئەمە هی کێیە؟

ئەمجارە دایکم شیڕاندی:

– مردووت مرێ ئەوەت لە کوێ هێنا؟

– کەوتبووە پشتی دەفتەری بیرکارییەکەمەوە.

کارتەکانم پێشاندا

– ئەدی ئەمانە هی کێن؟

دەموچاوی خوشکم سوور هەڵگەڕاو پرسی:

– ئەمانەت لەکوێ دۆزییەوە؟ من زۆریان بەدوادا گەڕاوم.

– لە ناو کۆمەدییەکەی مندا بوون.. مەترسە نەمخوێندوونەتەوە؟ ها بیانگرە.

پاندانەکەم دیار نەبوو. زۆری لێگەڕام بێهودە بوو.. و دەستم بە بۆڵە بۆڵێ کرد.

دایکم پرسی:

– دیسانەوە چیت ونکردووە وا بۆڵە بۆڵتە؟

– پاندانەکەم دیار نییە.

دایکم بەسەریدا شیڕاندم:

– کچێ هەی هیچ و پوچ، تەنانەت نازانی قەڵەمەکەشت لە کوێیە؟ نەنکیشم هەر هەڵیدایە و گوتی:

– تۆ تا ماویت لەم بێ سەرو پاییەت واز دێنی؟

کێشەکە خەریك بوو تەواو دەبوو باوکم هەڵیدایە:

– چەند جارم پێگوتی هەر شتەو لە جێگای خۆی دابنێ تۆ لای خۆت کچی، کچ نابێ هێندە بێ سەرو پا بێت.

خوشکم گوتی:

– وەرە ئێستا بە قەڵەمی من بنووسە.. بەڵام ونی نەکەی ها!

خوشکم چوو لە ژوورەوە قەڵەمەکە بێنێ بەڵام زۆری پێچوو.. دواییش هەر لەوێوە هاواری کرد:

کێ قەڵەمەکەی منی هەڵگرتووە؟

نەنکم نارەحەت بوو:

– کچ و کوڕی وەکو ئێوە ماڵ بەڕێوە دەبەن، تڕحێو، ئێوە ناتوانن قەڵەم و دەفتەری خۆشتان هەڵگرن!

دایکم سەر لەنوێ کەوتەوە بۆڵە بۆڵێ:

من نازانم ئەمانە چوونەتەوە سەرکێ؟ ئێمە هیچ کاتێ بەم شێوەیە هەڵپڕژاو و داپرژاو نەبووین.

باپیرم کە ئەفسەری خانەنشینەو خاوەنی ڕەفتارو بیرکردنەوەیەکی سەربازیانەیە لە قسەکەی دایکم توڕەبوو و گوتی:

– ئێوە خەریکن ئامۆژگاری ئەم منداڵە بەستەزمانانە دەکەن کە بەقەدەر نیوەی پەنجەی خۆتانن. دەشڵێن بە کێ چوونەتەوە. بە خۆتان! فنتان کردووە و ئەمانەتان لە کونە لوتەوە دەرپەڕیوە! خۆشتان لە هەمووان خراپترن.. هیچ کاتێ نازانن چیتان لە کوێ و لە کوێ داناوە.



– بژی بابە گەورە.. لەو پشتیوانییەی کردینی زۆر خۆشحاڵ بووم. دەمزانی کەس ناتوانێ قسەی لە قسەیدا بکات، بەڵام نەنکیشم ئیشەکەی تێکدایەوە کە گوتی:

– تۆ کە ئاوا قسە دەکەی منداڵەکان هێندەی دی بەخۆ دەنازن و خۆبەردەدەنەوە.

کاتێ دەمی باپیرە دەبۆوە هێندە بەئاسانی کۆڵ نەدەدایەوە. بە توڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

– گەورە ئاو دەڕێژێ و بچووك پێی لێ دەخا، کاتێ کاروباری گەوران ڕێك و پێك نەبێت دەبێ چاوەڕێی چی لە منداڵ بکرێ؟ گیا لە سەربنجی خۆی دەڕوێتەوە، دایك و باوك کە ئیشیان لەجێی خۆیدا نەبێ ئاشکرایە کە منداڵیشیان ڕێك و پێك نابن، لەماڵێدا دەبێ هەر شتە و جێگای تایبەتی خۆی هەبێ. تا هەر کاتێ پێویست بوو بتوانن بیدۆزنەوەو بەخۆڕایی کات بەفیڕۆ نەدەن.

باوکم قسەی باپیرەی پەسەند کردو گوتی:

– باپیرە لەسەردەمی سەربازیشیدا هەر بەڕێك و پێکی ڕاهاتووەو پەروەردە بووە. منیش هەروا ساڵەهایەکە کەل و پەلەکانم هەریەکەیان جێگای تایبەتی خۆیان هەیە. هەمیشە دەزانم چەرخەکەم لەناو کام گیرفانمە. دەستەسڕم لەکوێیە! جزدانی پارەم خستۆتە کوێوە.

– باپیرە سەرێکی بادا:

– بەڵێ پیاو دەبێ وابێ!

دایکم لەگەڵ ئەمەدا نەبوو:

– چۆن. پیاو هەندێ جاریش لێی تێك هەر دەچێ.

باوکم ئەمەی بەدڵ نەبوو و نەڕاندی:

ئەمە گۆ و ئەوە مەیدان! و بۆ ئەوەی زیاتریش سەرنج ڕاکێشێ لەجێی خۆی هەستاو چاوی نووقاندو گوتی:

– سەیرکەن من هەمیشە چەرخەکەم دەخەمە گیرفانی چەپی پانتۆڵەکەمەوە. هەموو بەوردی خەریکی سەیرکردن بووین، باوکم هەروا بە چاوی نووقاوەوە دەستی بۆ گیرفانی پانتۆڵەکەی برد تا چەرخەکەی دەربێنێ!. بەڵام هەرچەند گەڕا چەرخەکەی نەدۆزییەوە. زۆر تورە بوو. بۆ ئەوەی تەریقیش نەبێتەوە قسەکەی گۆڕی و گووتی:

بۆ نموونە بەچاوی نووقاوەوە دەزانم قەڵەمەکەم لە کوێیە! هەمیشە دەیخەمە گیرفانی چەپی چاکەتەکەمەوە: دوایی هەر بەچاوی نووقاوەوە دەستی بردە گیرفانییەوە. ماوەیەکی تێگەڕا. چونکە لە قەڵەمەکەش سوسەیەك نەبوو! هەمووومان پێکەنین گرتینی و نەشماندەتوانی هیچ بڵێین، باپیرم بە تەوسەوە گوتی:

– باوکم کە لە شەرما ناوچەوانی ئارەقەی کردبوو گوتی:

دەڵێی گیرفانەکەم کون بووە. کەوتۆتە خوارێ. ئەوە نییە لێرەیە! دەستی بردە خوار گیرفانی چاکەتەکەیەوەو شتێکی دەرێنا، بەڵام قەڵەم نەبوو. غەرغەرەی دەزووی دایکم بوو لەخوارگیرفانی باوکمەوە هاتە دەرێ.

باوکم بە تووڕەییەوە پرسی:

– ئەم غەرغەرە دەزووە لە گیرفانی مندا چ دەکا؟

دایکم خێرا ڕاپەری و غەرغەرەکەی لەدەست قۆستەوە:

– ئاه.. پێرێ ویستم قۆپچەی کراسەکەت لێ نێمەوە لەناو جلەکانتا لە بیرم چووە!



باپیرم هێندە پێکەنی کۆکەی پێوە نووسا. هەروا دەکۆکی و لە گیرفانەکانیشیدا بەدوای دەستەسڕەدا دەگەڕا. دوای ئەوەی تاوێك گەڕا گوتی:

– دەستە سڕەکەم لەگیرفانی پاڵتۆکەمدایە.

من رامکرد و چووم دەستەسڕی بابە گەورە لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا کە لە ڕاڕەوە هەڵواسرابوو بێنم، بەڵام هەر چەندە گەڕام دەستەسڕ ئاسەواری نەبوو گوتم: بابە گەورە نییە.

بەسەریدا گرماندم:

– من چل ساڵە دەستەسڕ دەخەمە گیرفانی ڕاستی پاڵتۆمەوە.

دایکیشم هات، پێکەوە بە دوای دەستەسڕا کەوتینە گەڕان بەڵام بێسوود بوو، باپیرم گوتی:

– پاڵتۆکە بێنن بزانم. خۆ ئێوە هیچتان لەدەست نایەت.

پاڵتۆکەمان هێنا، ئاشکرا بوو پار کە پاڵتۆکەیان هەڵگێڕاوەتەوە بەرگدرووەکە لەبیری چووە گیرفانی بۆ بکاتەوە. باپیرە هەر گیرفانیشی نییە!. باپیرە زۆر تووڕە بوو ویستی جگەرەیەك بپێکات بەڵام هەرچەند گەڕا قوتووی جگەرەکەی نەدۆزییەوە بە تووڕەییەوە گوتی:

– قوتووی جگەرەکەم لەکوێیە؟

نەنکم وەڵامی دایەوە: هەر لەوێ بوو.

هەموو لە هەموو دەستمان کرد بە گەڕانێ. وەکو جووجەڵە مریشك کە بە دوای داندا بگەڕێن.. بۆ دۆزینەوەی قوتووی جگەرەی باپیرەی بەملاولادا بڵاوبووینەوە، نەنکم. خوشکم. کارەکەرەکەمان هەر هەمووومان کەوتینە گەڕان و پشکنینێ. باپیرم زۆر تووڕە بوو و هەر هاواریشی دەکرد:





–   خێراکەن – بگەڕێن. زوو بیدۆزنەوە. دەنا...

چونکە هەموومان لە باپیرم دەترساین نەماندەتوانی ورتە بکەین. دایکم کە زۆر قەڵەوە چووە ژێر قەنەفەکە بگەڕێ لەوێ گیر بوو و نەیتوانی بێتەوە دەرێ. سێ چوار دەستەکی قاچیمان گرت و ڕامان کێشایەوە دەرێ هەریەکەو شوێنێك دەگەڕا. یەکێك ناو تاقەکان، یەکێ پشتی کۆمەدییەکە. و یەکێ خەریکی ژێر فەرشەکان بوو. برۆ چرەکانی باپیرم هاتبوونەوە سەرچاوی، لەناکاودا... نەڕاندی:

–   دەڵێی لەگەڵ ئێوەم نییە؟ خێراکەن بیدۆزنەوە!.

پرسیم: ئەم گۆرەوییانە هی کێن؟

دایکم وەڵامی دایەوە:

–   ئۆ.. ی قوڕی دنیا!. ئەمە لەکوێ بوو؟ مانگێکە بە دوایاندا دەگەڕێم. خوشکەکەم پسوولەیەکی ئاو و کارەبای بەدەستەوە بوو هاتەوە ژوورێ و گوتی: ئەمە چییە بە کەڵك دێ؟

باوکم وەڵامی دایەوە:

–   کچێ ئەم پسوولەیە بۆ لای تۆیە؟ ماوەیەکە من بەدوایدا دەگەڕێم.

–   لە باڵکۆنەکەدا لە ژێر گوڵدانەکاندا بوو.

کاتێ کە بەدوای قوتووی جگەرەکەی باپیرەدا دەگەڕاین هەریەکەو شتێکی دەدۆزیەوە و دەیپرسی:

–   ئەمە هی کێیە؟

ئەوە باپیرەش هەر نەڕەیەتی:

–   خێراکەن جگەرەکەم بدۆزنەوە.



چوومە کتێبخانەکەی باوکم. سوتیانێکم لەوێ دیتەوە! پرسیم: ئەمە هی کێیە؟

وامزانی هی خوشکەکەمە بەڵام کارەکەرەکەمان بە توڕەییەوە سوتیانەکەی لەدەست ئەستاندم و قیژاندی: ئەمەت بۆ لای خۆت هەڵگرتووە.

کەل و پەلێکی زۆر کە چەند مانگێك بوو بە دوایاندا دەگەڕاین و دیار نەبوون، لە کون و قوژبنانەوە سەریان وەدەر دێنانەوە. باوکم دوو چەنگاڵی لەناو تەنەکەی خۆڵەکەدا دۆزییەوە.

دایکم بە خزمەتکارەکەمانی گوت بچێ لە دەرەوە پاکەتە جگەرەیەك بۆ باپیرە بێنێ. باپیرە لەجێی خۆی ڕاستبۆوە پارە بۆ کڕینی پاکەتەکە دەرهێنێ، قوتووی جگەرەکە لەژێر خۆیا کەوتە سەر زەوی! باپیرە زیاتر تووڕە بوو و نەڕاندییەوە:

–   کێ ئەم قوتووی جگەرەیەی خستۆتە ژێر منەوە؟ چەند وەختە بەدوایدا دەگەڕێم بۆ ناڵێن لەکوێیە؟ ئێمە هەموومان سەربەخۆ پێکەنین. دایکم گوێی منی گرت و ڕایکێشاو گوتی:

ئەمجارە ئەگەر بێ ئەدەبییە بکەیت بیبەری تیژت دە زاری دەکەم.

لەو ڕۆژەوە بڕیارمداوە بەڕاستی ببمە کچێکی ڕێك و پێك. چونکە بەچاوی خۆم دیتم کە بێ سەرو پایی و نارێکی چەندە مێشکی ئادەمیزاد خراپ دەکات، ڕاستە کە دەڵێن: هەر ئاقڵە لە خەسارێ.

نامەکانی تۆشم خستوونەتە ناو دۆسیەیەکیەوە. ئومێدەوارم ژمارەی نامەکانت هێندە زۆر بن کە ڕۆژێك بێت ژمارەی دۆسیەکان بگاتە سەد دانە.

**سەرکەوتن و ساغیت لە خوا دەخوازم**

**زەینەب یالکەر**





## خۆتێهەڵقورتاندن

ئەستەمبۆڵ 15ی شوباتی 1967

ئاواڵی خۆشەویستم زەینەب:

ماوەی ئەو چوار ساڵەی کە پێکەوە لە قوتابخانەیەك بووین من تۆم بە یەکێك لە قوتابییە هەرە ڕێك و پێکەکان دادەنا. زۆریشم سەر لەوە سوڕماوە کە لە ماڵێ بە تەمبەڵ ناوت دەبەن. سەیر ئەوەیە کە منیش لەماڵەوە هەر بەو ناوەوەم بانگ دەکەن، بەڵام هی من ڕاست و دروستە، تەنانەت یەك ڕۆژیش نەبووە کە کەتنێك نەکەم، ڕۆژێ قاپ و قاچاغ بەردەدەمەوەو جارێك پیاڵەو ژێر پیاڵە دەشکێنم..

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمەوێ زۆر وردو ڕێك و پێك بم بەڵام بەدەست خۆم نییە.. نووسیبوت دایکت بە مەتینی گوتووە: ((بیبەری تیژت دەزاری دەکەم)). نەکەی لەم قسانە بترسی، تەواوی هەموو دایکێك لەم جۆرە قسانە دەکەن. دایکی منیش جار جارە ئەم جۆرە قسانە بە فاتێی خوشکم دەڵێت.

فاتێ زۆر بچکۆڵەیە هێشتا نەچۆتە قوتابخانە تازە بۆتە پێنج ساڵ. کاتێ منیش بچووك بووم دایکم پێی دەگوتم: ((بیبەری تیژت دەزاری دەکەم)) بەڵام هیچ کاتێ واشی لێنەدەکردم. بەتایبەتی چەند شەوێك لەمەو پێش دایکم ئەوەندە لەدەست فاتێ کلافە بوو خەریك بوو لەداخانی شێت بێ هاواری کرد: ((بیبەری تیژت دەزاری دەکەم)) لە ڕاستیشدا هەقی بوو وای لێبکات، چونکە فاتێ کارێکی زۆر خراپی کردو ئابڕووی هەموومانی لای بەڕێوەبەرەکەی باوکم برد. سەروبەری مەسەلەکەش بەم جۆرەیە:



باوکم هەمیشە پاشملە قسەی خراپی بە بەڕێوەبەرەکەی خۆی دەگوت و خراپەکانی ئەوی پەنجەژمێر دەکردن. بڕواشی وابوو کە ئەو پیاوێکی درۆزن و بێ بار و کەڵەکەبازە.))

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر کاتێ لە قوتابخانە گەڕامەوە ماڵێ. سەرەنجم دا ماڵ وەك جاران نییە. دووپارچە قاڵی نوێ لەناو ڕاڕەوەکەدا ڕاخراوەو بۆنی چێشتی خۆش مەتبەخەکەی پڕ کردووە، لە دایکم پرسی:

– ئەوە چییە؟ میوانمان هەیە؟

– بەڵێ بەڕێوەبەرەکەی باوکت ئەمشەو دێتە ئێرە.

لەبیستنی ئەم هەواڵە لە جیاتی خۆشحاڵ بم ترسێکی زۆرم لێ نیشت!. چونکە دەمزانی کە نێوانیان لەگەڵ یەکتردا خۆش نییە، دەترسام لێیان ببێ بە هەرا. بە سەرسامییەوە گوتم:

– ئەم سەگبابە چ کاری بە ماڵی ئێمەیە؟

دایکم لێوی خۆی گەست:

– ئەم قسەیە چییە دەیکەی کوڕە؟ ئەو پیاوێکی گەورەیە!

– هەر کەسێکە بە ئێمە چی! خۆ باوکم خۆشی ناوێ.

– ناخۆشییان تەواو بووە؟ ئێستا دەیەوێ ئیشێکی بداتە باوکت.

ئێوارێ باوکم لە ڕۆژان زووتر هاتەوە ماڵێ. لەپێشدا سەرێکی کێشایە مەتبەخەکەوە.. دوایی هۆڵەکەی تەماشا کرد. کە دڵنیا بوو هەموو شتێك ئامادەیە چووە بەر پەنجەرەکەوە بۆ ئاگاداری و چاوەڕوانی هاتنی بەڕێوەبەری.

بەڕێوەبەر فەرمووبووی کاتژمێر شەش دێم... بەڵام کاتژمێر گەیشتە نزیکی حەوت کەچی هێشتا هەر دیار نەبوو. باوکم دەستی بە بۆڵە بۆڵ کرد:





((نازانم ئەو پیاوە لەکوێ گیر بووە؟ بۆ هەر نەهات؟.)) دواییش زۆر جنێوی خراپ و قسەی ناسکی وای پێدا کە کەڵکی نوسینێ ناگرن.

دایکیشم فاتێی بانگ کردو ئەو شتانەی کە پێویستە لای میوان ڕەچاوی بکات پێی گوت: ((کچەکەم نەکەی لای میوانەکە ئابڕوومان بەری؟ نەکەی پەنجەت بخەیتە لوتتەوە! ئەگەر کۆکەت هات دەست بە دەمتەوە بگرە. شتێك کە کەوتە سەر زەوی هەڵی نەگریەوەو بیخۆی! هەرگیز نەڵێی (ها))).

– ئەدی بڵێم چی؟

– بڵێ ((بەڵێ)) هیچ کاتێ ((بەڵێ))ت لەبیر نەچێتەوە. هەمیشە هەر بە ((بەڵێ)) دەست پێبکەو هەر بە ((بەڵێ))ش دوایی بە قسەکانت بێنە.

باوکم هێشتا لە پشت پەنجەرەکەوە خەریکی ئێشك (کێشك) گرتن بوو. لەنارەحەتی و ماندووەتی خۆیدا ئەژداد و ئابادی بەڕێوەبەری لە ڕەگەوە دەردەهێنا! ((دێ نایە بە جەهەننەم! ئەگەر نەهات چبوو؟)) لەبەر خۆمەوە گوتم:

((خوا بکا نەیەت. چونکە لەوانەیە باوکم لەبەردەمی ئەویشدا ئەم قسانە بکات و ببێتە هەرایان!.)) لەم کاتەدا دەنگی هۆڕنی ئۆتۆمبیلێك لەسەر جادەکەوە هات. باوکم کە لە ژوورەوە خەریکی ڕاوێچکان بوو ڕایکردەوە بەرپەنجەرەکە و بە خۆشییەکەوە هاواری کرد: ((هات)).

لە پەنجەرەکەڕا سەیرێکی دەرەوەم کرد. ئۆتۆمبیلێکی شیك لە بەردەمی ماڵەکەماندا وەستا بوو. دڵم کەوتە تەپە تەپ، هەر لێکم دەدایەوە. ((ئەگەر هەرایان بێت چ بکەم؟.))

بڕیارم دا ئەگەر هەرایان بوو لە پشتەوە بەتوندی شتێك بەسەری بەڕێوەبەری دادەم!



باوکم دەرگاکەی کردەوە چووە خوارێ. من لەسەرەوە خەریکی سەیرکردنی ئەوان بووم. لەکۆڵانێ باوکم تا ناوقەدی چەمایەوە!. وامزانی دەیەوێ بەرد هەڵگرێتەوەو بەسەری بەڕێوەبەری دادا! بەڵام نەء، تێگەیشتم خەریکە ئیکلامێ دەکێشێ! کاتێکیش لە پلیکانەکان هاتنە سەرێ گوێم لێبوو باوکم دەڵێ: ((قوربان زۆرمان چاو لە ڕێوەبوو! یاخوا بەخێر بێن، بە ڕاستی گەورەتان کردین!)).

بەدەم ئەم قسانەوە هاتنە ژوورەوە، باوکم پاڵتۆکەی لێوەرگرت و کردی بە دارا و دوایی بە من کە لای دیوارەکەوە گێژو وێژ وەستابووم گوتی:

((بۆ دەستی مامە گیان ماچ ناکەیت؟.))

ناچار بووم دەستی بەڕێوەبەر ماچ بکەم! باوکم بەڕێك و پێکی دەربارەی چاکەو پیاوەتی ئەو خەریکی شەن و کەوێ بوو. پێکەوە چوونە ژوورێ. تاوێکیان سرت و ورت کرد. جار جارەش دەنگی قسەکانی باوکم دەگەیشتە گوێی ئێمە:

((دروستە.. دەکرێ... هەرچۆنێ بفەرموون... پڕ بە دڵ..))

دایکم چووە ژوورێ و گوتی:

– ئەگەر چی ئەوەی هەشمانە خواردنی ئێوە نییە.. بفەرموونە سەرمێز.

بەڕێوەبەر سەرێکی بادا:

– من ناتوانم لە دەرەوە هیچ بخۆم.

لەبەرخۆمەوە گوتم:

((دایکی بەستەزمانم ئەم هەموو ماندوویەتییەی کێشاوەو بە هەزار قەرزو قۆڵەو نارەحەتییەوە خواردنی ئامادەکردووە کەچی یارۆ نازو نوزان دەکات و نایەوێ ئێواری بمێنێتەوە.))

لەدواییدا باوکم بە هەزار سوێندو تکاو پاڕانەوە جەنابی بەڕێوەبەری بۆ ناخواردنی ئێوارێ هێشتەوە کاتێ چووینە سەرمێز هێندەم ڕق لە خۆهێنان و بردنی بەڕێوەبەری هەستا بوو دەمەویست خنخنۆکەی بگرم و هەناسەی لێببڕم. لە توڕەییاندا هەموو لەشم دەلەرزی.

- کوڕە پەرداغێك ئاو بۆ جەنابی ڕەییسی پڕکە!

هەولم دەدا دەستم نەچێتە پەرداغەکەوە و کاکی ڕەییس نارەحەت نەبێ، بەلام بۆ بەدبەختی یەکسەر دەستم تەتەلەی کردو ئاوەکە ڕژایە سەر مێزەکە. دایکم تووڕە بوو و گوتی:

- ئاگر لە دەست و پلی ئەم مندالە دەبارێ.

باوکیشم پشتیوانی کرد:

- مندالٚ بەم زلییە ئاو تێکردنێك: نەزانێ.

لە شەرمەزارییاندا خەریك بووم ببمە ئاو. باوکم دەستە سڕەکەی هێنا سەرمێزەکە وشك کاتەوە دەستی لە قاپی زەلاتەکە هەلەنگوت و وەریگێڕایە ناو کۆشی جەناب ڕەییسەوە.

دایکم لێوی خۆی کرۆشت.

- وای.. خاکی دنیا.. ڕژایە سەر جلەکانتان؟

دایکم دەست و برد ڕاست بۆوە تا جلەکانی جەنابی بەڕێوەبەر پاك کاتەوە، قاچی لە مێزەکە گیر بوو و قاپە شۆرباو بە سەرقاچی فاتێدا ڕژا! قاچی فاتێ سووتاو دەستیکرد بە گریانێ!

دایکم تووڕە بوو و بەسەر فاتێیدا قێژاند:

- قەززەلقورت! کچ لە بەردەمی میواناندا چۆن دەگری.



فاتێی بێچارە هەولێدەدا دەنگی دەرنەیەت. گریانی لە ئەوکێ مابوو هەر هەنیسکی دەدا. جەنابی ڕەییسیش کە لە سەغلەتیاندا دەستی دەلەرزی خوێدانەکەی هەلگرت، ویستی تۆزێك خوێ بە خواردنەکەیدا بکات، سەری خوێدانەکە شل بوو کرایەوەو هەموو خوێیەکە ڕژایە چێشتەکەوە!.

دایکم بە تەواوی شلەژاو نەیدەزانی چی بکات.

کەسێك کەلەسەر مێزەکە هەلەی نەدەکرد تەنیا من بووم، و سەد سوپاس بۆ خوا کە بەساغی لەسەر مێزەکە هەستام. کاتێ قاوەیان هێنا جەنابی ڕەییس لەمنی پرسی: پۆلی چەندی؟.

چونکە دایکم زۆری گوتبوو کە هەر قسەیەك دەکەم بە ((بەلێ)) دەست پێبکەم وەلامم دایەوە:

- بەلێ.. پێنجەم.. بەلێ.. دەچم.. بەلێ.

ڕەییس قاقا پێکەنی و پرسی:

- تەمەنت چەندە!.

- بەلێ... یازدە سال.. بەلێ.

کە گەورە بوویت پێت خۆشە ببی بەچی؟

- بەلێ...؟ نووسەر.. بەلێ.

- ئافەرین.

دواییش هەموو بێدەنگ بووین و دایکم بە ئاماژەی چاو و برۆیان تێیگەیاندم کە سوپاسی جەنابی ڕەییس بکەم. هەرچەندە ماوەیەکیش بوو هەموو بێدەنگ بوو بووین، من لەپڕ بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم:

- بەلێ... سوپاست دەکەم... بەلێ.





جەنابی ڕەییس وایزانی خەریکین گاڵتەی پێدەکەین!.

دیاربوو زۆر سەغڵەت بوو بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا!.

باوکم بۆ ئەوەی گومان نەهێڵێ چەند وردە کۆکەیەکی کردو دەیویست قسەیەك بکات.

فاتێ هەڵیدایەوەو گوتی:

– بابە دەست بەدەمتەوە بگرە! پیاو نابێ لای میوانان وا بکۆکێ!

دایکم کە دیتی خەریکە کار لە کار بترازێ، دەست و پێی خۆی ون کردبوو و ناچار بۆ ئەوەی مەسەلەکە پینە بکات بە فاتێی گوت:

– هەستە بۆ دەرێ.

فاتێ وایزانی مەبەستی دایکم ئەوەیە کە بچێ بۆ تەوالێت، بە ناقایلییەوە وەڵامی دایەوە.

– دایە ئەم شتانە لای میوان بێ ئەدەبییە!.

جەنابی ڕەییس ئیدی نەیتوانی هیچی دی خۆی بۆ ئەم تەشەرانە ڕاگرێ.

بەگرژو مۆنی و ناقایلییەکەوە هەستاو بێ ماڵئاوایی بۆی دەرچوو.

باوکم ڕایکرد بە دوایدا. دایکیشم کە بە هەردوو دەستان ڕوومەتی خۆی دەڕنییەوە گوتی:

– خوا کوێرتان کا، خۆ ئابڕووی ئێمەتان برد!

باوکم کە گەڕایەوە بێدەسەڵاتانە بە دڵگیرییەوە لەژێر لێوەوە دەیبۆڵاند: ((ڕۆیی نەڕۆیی ملی بشکێ، خۆی بەچی دەزانێ، لەسایەی سەری ئێمەوە بۆتە ڕەییسی ئێمە!))



من گوتم: ((ئەی بۆچی هێندەتان ڕێز لێدەگرت؟)).

باوکم زللەیەکی مزری لەبناگوێی من داو دایکیشم فاتێی بردە مەتبەخ تا دارکارییەکی باشی بکا ((تا لەمەودوا ئاوا خۆ لەشتان هەڵنەقورتێنین!)).

زەینەب دەمویست نامەکە کورتتر بکەمەوە، بەڵام درێژ بۆوە. چاوەڕوانم پشووی هاوین بێتە ئەستەمبۆڵ و بەیەکەوە بەدرێژی بدوێین. ئێوە بەلانی کەمەوە ئەنقەرەتان دیوە بەڵام من چی؟ تا ئێستا لە ئەستەمبۆڵ نەچوومەتە دەرەوە!.

**داواکاری سەرکەوتنتم، چاوەڕوانی وەڵامتم**

**ئەحمەد تاربای**

# نیشتمان پەروەر بن

ئەنقەرە 21ی شوباتی 1967

برام ئەحمەد. پرسیبووت پشووی هاوین دێمە لات یان نا؟. باوکم ناتوانێ مۆڵەت وەربگرێ، چونکە هێشتا ساڵێکی تەواو نەکردووە. بەڵام من و دایکم بۆ ماوەی مانگێك دێینە ئەستەمبۆڵ. دیارە هێشتا نەبۆتە هاتنی تەواو، چونکە دایکم بەبێ باوکم پێیناخۆشە بچێتە سەفەرێ، باوکیشم ناتوانێ لێرە بە تەنیا بمێنێتەوە! لەم ناوەدا تەنیا هەرمنم کە زۆرم حەز لە سەفەرە.

پوورم لە ئەستەنبۆڵ دادەنیشێ و سەفەرەکەش بۆ ئێمە زۆری تێناچێ، پەنا بەخوا هەر دێین و لەوێ یەکتر دەبینین. چەند ڕۆژێ لەمەوبەر ئیشێکی خراپم کرد کە ناتوانم پێت نەڵێم. تەنها مەتین لەم باسە ئاگادارە ئەو هەمیشە لە ئیشی چەوتدا هاوبەشی گوناهەکانی منە! تۆ دووەمین کەسێکی کە ئەم بەسەرهاتە دەبیسی. ڕاستی بەسەرهاتەکە بەم جۆرەیە:

یەك شەممەی ڕابردوو چوو بووینە ماڵی باپیرە. ماڵەکەیان لەگەڵ ماڵی ئێمە زۆری نێوانە، لەگەڵ ئەوەیدا کە باپیرم زۆر پیرە لە قاتی هەرە سەرەوەی ئاپارتمان (شوققە)ێکدا دەژین، ماوەیەکی زۆر بە دوای قاتی خوارەوەدا گەڕان بەڵام دەستیان نەکەوت.

کاتێ باپیرم لە پلیکانەکان وەسەر دەکەوێ دوو سێ جاران لە ناوەڕاستی پلیکانەکاندا ماندوو دەبێ و دادەنیشێ تا ماندووەتی دەحەسێتەوە دیسانەوەش خوا کردوویەتی کە لە قاتی سێهەم و چوارەم و پێنجەمدا نین دەنا لەم ڕۆژانەدا ڕۆژنامەکان هەواڵی کارەساتێکی گرنگیان لە ڕووپەرەی یەکەمدا چاپ دەکرد!.



ئەو ڕۆژە خوشکم نەهات، ئەویش میوانی هەبوو. من و دایکم و مەتین بە پاس چووینە ماڵی باپیرم. نەنکم خواردنێکی باشی بۆ لێنابووین. دوای نانخواردنی نیوەڕۆیە باوکم و باپیرم وەك جاران بەرامبەر یەك دانیشتنەوە، قاوەیان دەخواردەوەو قسەیان دەکردن. لە ڕەفتاری پڕ بە دڵی ئەوان و خۆشەویستیەی کە لە چاوی هەردووکیاندا شەپۆلی دەدا زۆر خۆشحاڵبووم. بەڕاستی شادی و خۆشییەکی تایبەتییان هەبوو.

لە هۆڵەکەدا جگە لەو سێیەمان کەسیتری لێنەبوو. من بە ڕواڵەت سەرگەرمی خوێندنەوەی ڕۆژنامە بووم بەڵام لە ژێرەوە هەر سەیری ئەوانم دەکردو گوێم بۆ قسەکانیان شل کردبوو.

باپیرم زۆر حەزی لە سیاسەتە. هەر کاتێ لەگەڵ باوکمدا بێ لە سیاسەت نەبێ لە هیچی دی نادوێ. بەتایبەتی دوای نانخواردنی نیوەڕۆ کاتێ قاوە دەخواتەوە خۆشترین کاتی ئەو ئەوەدەمەیە کە لەسیاسەتەوە بدوێ!. بەڵام ئەوەی خراپە تا فرێك لە قاوەکە دەداو دوو قسان لەبارەی سیاسەتەوە دەکات وەنەوز دەیباتەوە. باوکی بێچارەم ناچار بۆ باپیرەم کە لەنێوان خەو و بێداریدایە، لە ئاسمان و ڕێسمانەوە قسە بێنێ و ببا. یەك تۆز بێدەنگ بێ وەنەوزی باپیرە دەرەوێتەوەو باوکم ناچار وا دەکا درێژە بە قسەکانی بدات. ئەو ڕۆژەش لەگەڵ یەکەم رستەی قسە سیاسیەکاندا باپیرە خەو بردییەوە. باوکم کە دیتی باپیرە نوستووە لەسەرخۆ هەستا لە ژوورەکە بچێتە دەرێ بەڵام باپیرە کتوپڕ چاوەکانی هەڵێنانەوە و گوتی:

- باشە، دوایی چی بوو؟

باوکم خێرا لەسەر کورسییەکە دانیشتەوە، نەیویست کارێ بکات کە باپیرە بڕەنجێ. باوکم دەمی کردەوە قسە بکات، باپیرە سەر لە نوێ کەوتەوە پرخەی خەوی خۆش!





باوکم بەو جۆرە بەبێ ئیش دانیشت و لەدەم و چاوی باپیرەوە ڕامابوو. دوای چەند دەقیقەیەك دیسانەوە باپیرە چاوی کردەوەو گوتی:

– گەیشتبووینە کوێ؟

باوکم نەیدەزانی چی وەڵام بداتەوە. هەر قسەیەکی دەکرد باپیرە بە پێچەوانەوە دەدوا. هەندێ جار لێیان دەبووە بگرەو بەردە لەبەر ئەمە ئەو ڕۆژە باوکم زۆر سەغڵەت بوو.

باپیرە لە کاتێکدا وەنەوزی دەدا گوتی:

باشە بەم جۆرە بەڕای ئێوە ئەڵەمانەکان چ دەکەن.

باس باسی ئەڵەمانەکان هەر نەبوو! بۆیە من خۆم پێنەگیراو لە پڕمەی پێکەنینێم دا، باوکم چاوێکی لێ زەق کردمەوەو بە ئاماژە بێدەنگی کردم. دوایی ڕووی کردەوە باپیرەو گوتی:

دیسانەوە باپیرە خەو بردییەوە! هەر باوکم بێدەنگ بووەوە باپیرە دووبارە پرسییەوە:

– ئەمەریکاییەکان بەرامبەر ئەمانە چ دەکەن؟

من لە پێکەنیندا هێندەی نەمابوو هەناسەم لێببڕێ. بەزەحمەت خۆم ڕاگرت و سەرم خستە پشت ڕۆژنامەکەوە تا پێکەنینەکەم نەبینن. باوکم زۆر بەڕاشکاوییەوە وەڵامی دایەوە:

– ئەمەریکاییەکان دەیانەوێ ببنە گەورەی هەموو دنیا، و سوپای ئەمەریکا، باپیرە دیسانەوە نوستەوەو دوای تۆزێك سەرلەنوێ هەستایەوە و پرسی:

– پاپا بیروڕای چییە؟



– بیروڕای پاپا زۆر کۆن و دواکەوتووانەیە!.

ئەم بەرنامەیە هەروا بەم شێوەیە درێژەی کێشا. وردە وردە قسەکان ڕوویان لە باریکییەوە دەکرد. دەربارەی پێشکەوتنی وڵات. سیاسەتی ناوەوەو دەرەوەی دەوڵەت، هێنان و ناردنە دەرەوە، و کشتوکاڵ، زۆر قسە کران. چەند قسەیەکیشیان لەبارەی هەندێ مەسەلەوە کرد کە ناگوترێن و باس ناکرێن. باپیرە دیسانەوە خەریك بوو خەو دەیبردەوە زەنگی دەرگای دەرەوە لێدرا چووم دەرگاکەم کردەوە. پیاوێکی پیری بەسەرو سیما بوو. پرسی:

– باپیرە لەماڵەوەیە؟

هەواڵم دایە باپیرم و ئەویش چووە بەر دەرگاو هەر کە چاوی بەو پیاوە کەوت بەڕووخۆشییەکی تایبەتییەوە هاواری کرد:

– بەهە، بەهە، ئەوە چۆنە بەخێر بێیت. ڕێت ونکردووە، یان بەهەڵە چوو ویت؟! میوانی بەڕێز قوتوویەکی مقەبای دایە دەست من کەسەروبنی ئاخنرا بوو، و لەگەڵ باپیرەدا بەرەو هۆڵەکە ملیان نا. منیش قوتووەکەم بردو دامە نەنکم. مەتین کە تا ئەو کاتە دیار نەبوو وەکو ڕمووزنان هاتە ژوورەوە! و هێرشی برد قوتووەکە لە دەست نەنکم بستێنێ. سەری قوتووەکەمان کردەوە سەیرمان کرد پڕە لە شیرینی، بەڵێ لەو شیرینیانەش کەمن لە سوێیانیان دەمرم. کاتێ شیرینییەکانی لرف دران، کەوتمەوە بیری میوانەکەی باپیرە. بەژن و باڵایم زۆر لەبەر چاوان ئاشنا بوو، بەڵام لەبیرم چوو بۆوە کێیە، و لە کوێم دیوە. چوومە هۆڵەکەو لە قوژبنێکدا دانیشتم و گوێم دایە قسەکانیان.

هەر لەبیری ئەوەشدا بووم ئەوەم لەکوێ دیوە.

یەکسەر بە قسەکانیدا ناسیمەوە. دەزانی کێ بوو؟ ئەگەر بیڵێم تۆش دەیناسییەوە. لەبیرتە پار لە جەژنی یادکردنەوەی دامەزراندنی کۆماریدا ڕۆژنامە نوسێك هاتە قوتابخانەو دەربارەی کۆمارییەت قسەی بۆ کردین؟.

کوڕەزاکەی لە پۆلی دووەمی قوتابخانەی ئێمە دەخوێنێ هەر بەم بۆنەیەشەوە ئەو ڕۆژە هاتبووە قوتابخانەو قسەی دەکرد.

لەبیرتە بەڕێوەبەری قوتابخانە چۆن لەبەردەمیا ڕاوەستابوو؟.

قسەکانی ئەو ڕۆژەی هێشتاش هەر لە گوێما دەزرنگێتەوە، ((کۆرپەکانم نیشتمان پەروەربن، ولاّتی خۆتان زۆر خۆشبووێت. نیشتمانتان باش بناسن، و کاتێ گەورەبوون سەرتاسەری ولاّتتان پێ بەپێ بگەڕێن. یارمەتی هەژاران و نەداران بدەن. ئەم ولاّتە ئەسپاردەی باو و باپیرانی ئێمەیە، هەر بەو جۆرەی کە گەیشتۆتە دەستی ئێمە پێویستە ئێمەش چاکترو باشتر بیدەینەوە ئەوانی دوای خۆمان)). کاتێ ئەو قسەی دەکرد هەموو پۆلەکان وەجۆش هاتبوون. من هێندەی کارتێکردبووم کە نەمتوانی خۆم ڕاگرم و لەو سەری پۆلەکەوە هاوارم کرد: ((بژی نیشتمان)).

باپیرم و میوانەکەی قسەکانیان بڕی و بە سەرسوڕمانەوە لەمن ڕامان. منیش جۆش و خرۆش وای هەڵگرتبووم بە زمانێکی گیراوەوە گوتم:

– پار جەنابت هاتیتە قوتابخانەکەی ئێمە؟

– بەڵێ کوڕەزاکەم لەوێ دەخوێنێ، باشم لەبیرە ئەو ڕۆژەش ئەو دروشمەت دا: دووبارە کەوتنەوە گفتوگۆ، و منیش بێدەنگ لە قوژبنێکا دانیشتم و گوێم دایەوە قسەکانیان. دەزانی دوایی چی بوو؟. ئەو قسانەی کە ئەو پیاوە دەیکردن لەگەڵ ئەوانەی ئەو ڕۆژەی زۆر جیاواز بوون.. بەجۆرێك کە بیرو باوەڕمی دەربارەی ئەو گۆڕی. ئەم بابایە کوڕێکی هەیە کە بڕیارە بۆ سەربازی بینێرنە گوندان، بەلاّم چونکە کوڕەکەی کوڕی نازێیەو هەر لەخۆشییاندا ژیاوەو ژنی ئەمەریکایی هەیە، ناتوانێ لەگوندانادا بژی و ئێستاش باوکی سەر بەم دەرگاو ئەو دەگادا دەکات تا، وەکو خۆی دەڵێت، بینایی چاوانی بێنێتەوە شاری!.



نازانی چ قسەیەکی دەکردن... هێندەی ڕەخنە لە وەزع و بارو دۆخ و گوزەرانێ دەگرت، هەروەك هەموو لە هەموو تەگبیریان لەو کردبێ و مافی ڕەوای ئەویان زەوت کردبێ!.

دەیگوت: ((ئەم ولاّتە جێی ژیان نییە!. لێرە کاروباری کەس بەرچاو ناگرن!))

داواشی لە باپیرم دەکرد کە چاوێکی لە کوڕەکەیەوە بێت و بۆ هێنانەوە شاریشی بۆی بەجێگای بەرپرس و بەرزو کاریگەر بلێ!.

من لە بیستنی ئەم قسانە وەك سەهۆڵی بەر هەتاوی هاوینێ توامەوەو هاتمەوە سەر ئەوەی ئەو ڕۆژە چەند قسەی قەڵەو قەڵەوی دەکردن و چۆن چۆنی ئامۆژگاری ئێمەی دەکرد: ((ڕۆڵە خۆشەویستەکان نیشتمانپەرست بن.. لەپێناوی نیشتماندا گیانی خۆتان لا هەرزان بێت.. ئەگەر ولاّت پێشکەوێ گیانی ئێمە نرخی هەیە)) و زۆری تری لەم قسانە. بەلاّم ئەمڕۆ چونکە کوڕەکەی لە ڕێی خزمەتی نیشتماندا وەگیر هاتووە خەریکە شێت دەبێ!.

لە دواییدا نەمتوانی خۆم ڕاگرم، هەموو شتێکم بەلاوە نا پێم بلێن..

((بێ ئەدەب.. خۆتێهەڵقورتێنەر)) یا هەرچییەکی تریان دەوێ با بیلێن..

بەدەنگێکەوە کە مانای گاڵتەجاری دەدا گوتم:

– جەناب بۆ کوڕەکەی ئێوە لەگەڵ خەڵکی تردا چ جیاوازییەکی هەیە کە نابێ بچێتە گوندان و لەوێ خزمەت بکا؟ یا تێنەگەیی یا وای خۆپێشاندا.. بەگەرمییەوە پێکەنی و پرسی:

– ئازیزەکەم چت گوت؟

بەر لەوە قسەکە دووبارە کەمەوە، باوکم بە تووڕەییەکەوە پێی گوتم:

– هەستە بڕۆ قاوەیەك بێنە.. و بەم جۆرە منی لە کۆڵ کردەوە.. کاتێکیش قاوەکەم برد باوکم ئاماژەی دامێ بچمەوە دەرێ..

دایکم خەریکی جل شوشتنێ بوو.. بێ ئەوەی بهێڵم کەس پێ بحەسێ دوو قاڵب سابوونم هێناو هاویشتمنە ناو تەشتێك ئاوی گەرمەوە.. سابونەکان لە ئاوە گەرمەکەدا توانەوەو ئاوی تەشتەکە وەکو شیری لێهات!. دوایی تەشتە سابوناوەکەم بە هەر زەحمەتێك بووە هەڵگرت و بردم بە سەر پلیکانەکاندا کرد.. ئیشەکەم لە تەواو بوونێدا بو دیتم ئەوە مەتین لە سەرەوەی پلیکانەکانەوە وەستاوەو خەریکی سەیرکردنی منە. پرسی:

– خەریکی پلیکانەکان دەشۆی؟

گوتم:

– بەڵێ.. تکا دەکەم بە کەس نەڵێی تا پێشهاتەکەت پێ دەڵێم.

دوو بە دوو چووینە بەر دەرگا تا هەر کەسێ هات تێی بگەیەنین. چونکە دەمویست تۆڵە لە میوانەکەی باپیرە بستێنم، و دەشترسام یەکێکی تر ببێتە قوربانی. زۆری پێنەچوو میوانەکەی باپیرم مالاوایی خواست و هەستا بڕوا. باوکم و باپیرم بۆ بەڕێکردنێی لە ژوورێ هاتنە دەرێ. لە ڕاڕەوەکەدا تەوقەو مالاواییان کرد: ((ماڵ ئاوابێ قوربان)).

((خۆش هاتی کاکی برا و خۆشەویست)).

((هەرچی بفەرمووی ئامادەم)).

میوانەکە لە پشتەوە دەڕۆیی.. و قسەی دەکرد. نەگەیی وەلامداتەوە. قسەکەی هەر لە دەمیدا بوو. پێی لەسەر سابووناوەکەوە خزی و وەك چولەکەیەك کە لە هەوادا باڵە فڕەی بێ دەست ولاقی بە هەواوە سوڕیان دەدا. زۆری هەوڵ دا دەستی لە شتێك گیر بێ و خۆی پێبگرێتەوە، بێ سوود بوو.

تا وا بەسەر پلیکانەکاندا کەوت لە دڵی خۆمدا گوتم مێشکی پژاوە.



باپیرم و باوکم ڕایانکردو دەستیان گرت و بە دەم پەکو پەکوە ڕاستیانکردەوە. من و مەتینیش هێندە پێکەنین وەخت بوو بپسێین.

شوفێرەکەشی کە لەسەر شەقامەکەوە ئەوەی دیت بە خێرایی ڕایکردو فریای کەوت. میوانی باپیرە دەستێکی بە کەلەکەیەوە گرت و لە کاتێکدا وەك ئۆتۆمبیلی پەنچەر دەلەنگی لە دەرگاوە چووە دەرێ. مەتین لەبەر پێکەنینێ لەسەر گازەرای پشتێ کەوتبوو، بەلام من ترس گرتبوومی و لە دڵی خۆمدا گوتم: ((ئەگەر یارۆ سەری بە بەردێك بکەوتایەو خوا نەخواستە بمردایە، ئۆباڵی بە ملی کێ بوو؟)). بەکورتی سەد هەزار سوپاس بۆ خوا کە بە خێرگەڕا. کاتێ میوان ڕۆیی هاتینەوە هۆڵەکەو سەر لەنوێ باپیرە خەو بردبوویەوەو هەر ئێمە گەیشتینەوە ژوورێ چاوی هەڵێنانەوەو لە باوکمی پرسی:

– ئێ لە کوێ بووین؟

باوکم وەلامی دایەوە:

– لە هیچ کوێ نەبووین.

باپیرە گووتی:

– چیت دەگوت؟

– هیچم نە دەگوت.. بەڕاست بە تەمای چ بۆ کوڕی میوانەکەت بکەی؟

باپیرە بە گاڵتە جاڕییەکەوە پێکەنی:

– وازبێنە، بابە ئەوە لەوانەیە کە لە هەرلایەکەوە (با) هەڵکا ئەو شەنەی خۆی دەکا.

من ئەو ڕایەی باپیرەم زۆر پێخۆش بوو، پرسیم:

– باپیرە تۆ بۆ کوڕەکەی، بەئاواڵەکانت دەڵێی؟

– بەڵێ کچی خۆم چ بکەین. پیاو ئیشی بە خەڵکە و پێویستە ئیشی دۆستانیش ئەنجام بدرێ! دوایی سەری نایە سەر پشتییەکەی ژێر شانی و خەو بردییەوە!.

باوکم لە هۆڵەکە چووە دەرەوەو ئاماژەی ئێمەشی کرد بڕۆین و واز لە باپیرە بێنین سەرخەوێك بشکێنی. خوا کردی هیچ کەس نەیزانی کە کەوتنی میوانەکە کردەی ئێمە بوو دەنا کوتانێکی باشمان دەخوارد.

لە نامەکەی پێشووتدا نوسیبووت کە منیش نامەی دوور و درێژت بۆ بنووسم چاوت لێیە کە نامەکەی من لە نامەکەی تۆ درێژتر بوو.

**سڵاوم بە هەموو ئاواڵەکان بگەیەنە سەرکەوتنی هەمووان بە ئاوات دەخوازم**

**زەینەب یالکەر**



## میللەتێک کە حەزی لە گریانە

ئەستەمبۆڵ 27ی شوباتی 1967

خوشکی خۆشەویستم زەینەب.

داستانی ئەو ڕۆژنامە نووسە بەناوبانگەم خوێندەوە کە نوسیبووت، باشم لەبیرە چ ئامۆژگاریەکی دەکردین، ئەو لە دوای هەر قسەیەکەوە دەیگوت ((ڕۆڵەکانم نیشتمانپەرست بن.. سەرو ماڵتان لەپێناوی وڵاتدا بەخت کەن)). ئەو ڕۆژە هەموومان بەجۆش هاتبووین و فرمێسك بە چاوانماندا دەهاتە خوارێ. بەڵام ئەو دەمەی پیاو کارو کردەوەی ئەمانە دەبینێ تێدەگا کە چەند خۆش باوەڕو ساوێلکە بووەو چۆن هەڵخەڵەتێنراوە.

زەینەب گیان تۆ بێگوناهی. ئەمە خوو و ڕەوشتی میللەتی ئێمەیە، گریان و زوو کوڵ هەستان بۆتە بەشێك لە خوو و ڕەوشتی ئێمە.

دیوتە کاتێ دایکمان پیاز پاك دەکات چۆن هۆن هۆن فرمێسکی لە چاوان دیتە خوارێ!

هەر ژنێك بڵێ من لەکاتی پیاز پاك کردنێدا ناگریم درۆ دەکات! چونکە بەدەست خۆی نییە. خاسیەتی ئاوی پیاز ئەمەیە کە ئاو لەچاوی مرۆڤ دێنێ. قسەو گفتوگۆی هەندێ کەسیش هەمان خاسیەتی هەیەو بەبێ ئەوەی ئەو کەسە تێبگا چ دەڵێن لە خۆڕایی بە گریان دێ.

من خۆم یەکێکم لەو دڵناسکانە. تەنانەت ئەگەر یەکێك لە ڕادیۆوە بە گەرمی قسە بکات. فرمێسکم دێتەخوارێ. ڕۆژێك کە گوێم بۆ بێژەرێکی ڕادیۆ ڕاگرتبوو و فرمێسکم دەڕشت، باوکم ئاگای لێبوو و گوتی:

– ئەحمەد ئەوە ئەم پیاوە دەڵێ چی تۆ وا دەگریەی؟

لەبەر گریانێ نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە، لەڕاستیشدا نەمدەزانی چ دەڵێ. و هەر بە دەنگی گەرم و گیڕای ئەو کابرایە بووە، بە تایبەتی کاتێ کە دەنگی دەلەراندەوە زیاترم کوڵ هەڵدەستا.

زۆر لەمەوپێش ڕۆژێك باپیرم بردمیە مزگەوتێ. دوای نوێژ مەلایەك چووە سەر مینبەرێ و بە زمانی عەرەبی دەستی بە لە خوا پاڕانەوێ کرد.

باپیرم لە بۆڕەی گریانێیدا. لە گریانی گەرمی باپیرەشەوە منیش وەگریە هاتم.

کاتێ لە مزگەوت هاتینە دەرێ لە باپیرەم پرسی:

– تۆ عەرەبی دەزانی؟

– نەء.

– ئەی چۆن دەزانی چ دەڵێ؟

– خۆ مانای قسەکان تێنەدەگەیشتم.

– ئەدی بۆ دەگریای؟

– چۆن نەگریم؟ ئەدی چاوت لێنەبوو چەند بە سۆز دەپاڕایەوە!.

باپیرم لە پڕ سۆزی دەنگی مەلای وەبیرهاتەوە و دووبارە دەستی کردەوە بە گریانێ.

گوتم:

– باپیرە لە کوێ دیارە بەڵکە مەلا قسەی سەیر بکات؟



باپیرە لە قسەکەی من زۆری دڵ ڕەنجاو وەڵامی دایەوە:

– چۆن شتی وا دەبێ کوڕی خۆم؟ مەلاو قسەی سەیر بکات؟

لەخۆم ڕانەدیت لەوە زیاتر لەگەڵ باپیرەیدا پێوە بچم، و ڕەفتاری ئەو سەوزە فرۆشەم وەبیرهاتەوە کە هەموو ڕۆژێ ئاگام لێبوو کاتێ کە ئەوهای شتەکانی دەکرد چەند ژنێکی گەڕەکەکەمان بە کوڵ و دڵەوە دەگریان!. فرۆشیارەکە هاواری دەکرد ((پیازی باش، کاهووی تازە، کەلەرمی نایابمان هەیە))و ژنەکانیش دەگریان. دیارە کە مرۆڤ بۆ کاهوو و پیازو کەلەرم ناگری! دیاربوو بە دەنگی پڕ سۆزی پیاوە دەهاتنە گری.

بەڕاست وەبیرت دێ کە مامۆستایەکی ئەدەبیاتمان هەبوو هەڵبەستی زۆر باش دەخوێندەوە؟ هەر دەڵێی دوێنێیە من هەمووم لە بیرە. هەڵبەستەکەش ئەمە بوو ((غەمگین ڕۆیشتم و شاد هاتمەوە))و بەدەنگێکی تایبەتیش ئەم هەڵبەستەی دەخوێندەوە ((ڕۆیشتم)) و ((هاتمەوە)) کەشی درێژ دەکردەوە وەك سواڵکەرە کوێرەکان کە لەبەردەمی مزگەوتەکان دادەنیشن، ئەویش ئاوای دەنگی خۆی دەلەراندەوە:

((ڕ. ۆ..یشـ.. یشتم. شاد هات. مە.. مە.. و.. و.. ە)).

لە پۆلدا هەر کاتێ مامۆستا دەستی دەکرد بە هەڵبەست خوێندنەوە، من گریانم دەهاتێ. تەنیا ڕۆژێك نەبێ هێندە پێکەنیم زگم ژانی کرد!.

ئەو ڕۆژەش هەر ئەوەندە مامۆستاکەمان بە دەنگی لەرزان و باریکەڵەوە گوتی:

((غەمگین.. ڕۆ.. شـ.. شـ.. ت.. م.))

لە ژووری پۆلدا دەنگێ بەرز بۆوە و بە هەمان دەنگی پڕ سۆزەوە گوتی:

((خۆش.. ش.. ش.. هاها.. تییەوە.. خوا بکا برۆ..ی و نەیەیتەوە.))

مامۆستا زۆر تووڕەبوو و پرسی:





– ئەمە كام بێ ئەدەب بوو؟! بۆ خۆی بڵێ.. دەنا..

لە مێزی دواوە ((یاشار)) هەستا و گوتی:

– مامۆستا من بووم زۆر داوای لێبوردن دەكەم. خۆم پێ ڕانەگیرا.

مامۆستا ئەوی بەخشی و دێڕی دووەمی دەستپێكرد ((قومێك ئاوم دەنێ. لەرێی دوورەوە هاتووم)) كاتێ كە هەڵبەستەكەی دەخوێندەوە ئێمەشی فێردەكرد كە لە كوێ دەبێ دەنگمان گڕ كەین و لەكوێ ناسكی كەینەوە.

مامۆستاكەمان دەربارەی خاسیەتی دەنگە جۆر بە جۆرەكان زۆر داستانی بۆ گێڕاینەوەو بڕواشی وابوو كە جۆری دەنگ لە ژیانی مرۆڤدا زۆر كاریگەرە. داستانی یەكێك لە خاوەن كارخانەكانی گێڕایەوە كە زۆر خۆشە.

كریكارەكانی ئەو كابرایە لە كەمی ڕۆژانەكەیان زۆر ناقایل بوو ون. هەمیشە بڕیاریان دەدا كە بچنە ژووری سەرۆك و بەخۆشی و ناخۆشی و تەنانەت بە هەڕەشەو گوڕەشەش بێت ڕۆژانەكەیانی پێ زیاد بكەن.

بەڵام هەر كە خاوەن كارخانە چاوی پێدەكەوتن و بەدەنگی زوڵاڵی خاوەن مافێكەوە دەستی بە قسان دەكرد. بەشێوەیەكی ئەو تۆ دەدوا كە هەموو كرێكارەكان لە پێشنیاری باسەكە پاشگەز دەبوونەوەو تەنانەت هەندێ جاریش وا دڵگیرو سەغڵەت دەبوون دەگریان. لەبیریان دەچۆوە بۆ چ مەبەستێك هاتوونەتە لای سەرۆكی كارخانە، بەدەستی بەتاڵ و چاوی بە فرمێسكەوە لە ژوورەكەی دەهاتنەوە دەرێ.

لە دەرەوە لە یەكتریان دەپرسی: ((ئەرێ ئەوە كابرا چی گوت وا بە گریان هاتین؟)) ئێستا و ئەوساش پەیان بە مەسەلەكە نەبرد و سەریان لەم كارە دەرنەكرد! ڕۆژێكیان سەردەستەی كرێكارەكان بڕیار دەدا كە بەرامبەر قسەكانی كابرا خۆی ڕابگرێ و تا ڕۆژانەكەی زیاد نەكات لە ژەوورەكەی نەیەتە دەرەوە.



ئەو ڕۆژەش كابرا هەر لەگەڵ چاوی بە كرێكارەكان دەكەوێ دەست پێدەكات:

– براینە گرانە.. دەزانم دنیا گرانییەو گوزەرانتان ناخۆشە.

ئەم قسانە هیچی وای تێدا نەبوو گریان بێنێ بەڵام گریان لە ئەوكی هەموواندا گیر بوو!.

خاوەن كارخانە لە سەردەستەی كرێكارەكان دەپرسێ:

– چەند كەسان بەخێو دەكەی؟

– پێنج كەس.

– ئەی هاوار بە ماڵم. هەژاری بێچارە!.

ئەم قسانەی بە شێوەیەكی وا دەكردن كرێكارەكان توانایان لەبەر دەبڕا!.

سەردەستەی كرێكارەكان لەگەڵ ئەوەشدا كە هەر لێوی خۆی دەكرۆژێ، بەڵام خۆی پێ ناگیرێ!

خاوەن كارخانەكە لە سەردەستەی كرێكارەكان دەپرسێ:

– منداڵەكانت دەچنە قوتابخانە؟

– بەڵێ دووی قوتابخانەم هەن.

– پەكو پەكو بە خودای زۆر گرانە. زۆر ئەستەمە. خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ. دیارە ناتوانی میوەش بكڕی؟ گۆشتیش ئەوە كە هەر ناخۆن!.

ئەم قسانەی بە جۆرێكی وا بە سۆزو دڵسۆزانەوە دەگوتن كە دڵی بەرد ئاسای دەكرد بە ئاو.

– دیارە ناتوانی ساڵی دەستە جلێكیش بۆ خێزانەكەت بكڕی؟ خۆ ژن و منداڵەكانت نەخۆش نین؟

– ژنەکەم نا بەڵام باوکم نەخۆشە.

خاوەن کارخانە ڕێگای نەدەدا کەس قسەیەك بکات و یەك بە دوای یەکدا هەر دەیپرسێ:

– باشە، ئەگەر خوا نەخواستە نەخۆش بکەون چی؟

خۆ خوانەکا لەم زەمانەدا یەکێك نەخۆش بێت، دەرمانی دەوێ.. دکتۆری دەوێ.

خاوەن کارخانە کە دەزانێ ئەمجارە کرێکارەکان بڕیاری پێداگرتنیان داوە، لە پڕ وەك ژنی ڕۆڵە مردوو دەست دەکا بە گریان و دەپرسێ:

– چۆنی ((نەشتەرگەری)) دەکەن؟

– سەردەستە بە سەرسامیەوە دەپرسێ:

– کێ چۆن ((نەشتەرگەری)) دەکەین؟

– منداڵەکەت.

– من منداڵم نەخۆش نییە.

– ئەگەر ڕۆژێکی نەخۆش بوو!.

ئیدی سەردەستەش خۆی پێ ڕاناگیرێ:

– گەورەی بەڕێز تکا دەکەم، تۆ بی خوا مەگری ئێمە هەر چۆنێك بێت ژیانی خۆمان بەسەر دەبەین و ڕایدەبوێرین. تۆ دڵگیرمەبە. توخوا بەسە.

سەردەستە بەگریانەوە لە ژووری خاوەن کارخانە دێتە دەرەوەو لەو ڕۆژە بە دواوە ئەگەر کەسێکیان کارێکی پێویستیشی بە سەرۆك بێت ئیشەکەی بە نامە دەنوسێ و ئیتر جەنابی سەرۆك سەغڵەت ناکەن.



ئێستا تێدەگەم بۆ لە قوتابخانەمامۆستاکەمان شێوەی قسەکردن و هەڵبەست خوێندنەوەمان فێردەکات، بۆ ئەوەی بتوانین لە کاتی پێویستیدا بەکاری بێنین.

**داوای سەرکەوتنت دەکەم و چاوەڕێی نامەکەتم**

**ئەحمەد تاربای**

## یەکەم وانەی ژیان

ئەنقەرە 5ی مارتی 1967

برام ئەحمەد

پێش تاوێك ئەو نامەیەم وەرگرت کە 27ی شوبات ناردبووت. لەبەر ئەوەی دوێنێ خۆم کوتابوو ئەمڕۆ نەچوومەوە قوتابخانە، کاتێ لە ژوورەکەمدا خەریك بووم نامەکەتم دەخوێندەوە، بەدەست خۆم نەبوو هێندە بە دەنگێکی بەرز پێکەنیم کە دایکم لە ڕاڕەوەکەدا گوێی لە دەنگی پێکەنینەکەم بوو دەرگاکەی کردەوە و گووتی:

کچێ ئەوە دەڵێی شێت بوو وی وا لەگەڵ خۆتدا پێدەکەنی؟

وەڵامم دایەوە:

نامەی فلانی دەخوێنمەوە شتی زۆر سەیری نووسیوە.

دایکم هاتە ژوورەوەو پرسی:

– چی نوسیوە وا هێندەت لا خۆشە؟

نامەکەتم جارێکی دیش سەرلەبەر بۆ دایکم خوێندەوە. ئەویش قاقا پێکەنی. من زۆر جاران دەمەوێ لەبارەی ئەنجوومەنی قوتابخانەی دایکان و باوکانەوە شتێکت بۆ بنووسم. ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە نیمچە تایەکم لێیە بەڵام هەر گرنگ نییە دەتوانم داستانەکەت بۆ بگێڕمەوە. دوو سێ هەفتە لەمەوپێش لە قوتابخانە ئەنجومەنی مامۆستایان و دایك و باوکان پێك هێنرا. ئەو ئەنجومەنەش هەر مانگەی جارێك دەگیرێ.



لە پۆلی پێنجەم من لە پۆلەکانی دیش سێ کچ و دوو کوڕیژگەی دییان هەڵبژارد تا بە دەنگ میوانەکان و ئەندامانی ئەنجومەنەکەوە بچین و چاو شیرینیان بەسەردا بگێڕین.

ئەو ڕۆژە من زۆربەی کاتم لە ناو کۆبوونەوەی ئەنجومەنەکەدا بەسەر بردو بەوردی گوێم لەو قسەو باس و خواسانە گرت کە دەیانگوتن، لەبەر وەی کە زۆر خۆشن دەمەوێ سەر لەبەر بۆ تۆشیان بگێڕمەوە لە ڕاستیدا نەدەبوو ئەم نهێنییانە بدرکێنم، بەڵام چ بکەم هەروا دروست بوو وم، دوای ئەوەی دایکان و باوکان هاتنە هۆڵەکەوەو لە جێگای خۆیان دانیشتن، بەڕێوەبەری بەڕێز بە ئاماژەیەك بە منداڵەکانی گوت کە لە هۆڵەکە بچنە دەرەوە، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەستی خۆ ڕەپێش کردنێم زیاتر بجوولێ: ((دەبێ ئەمانە بیانەوێ چ بڵێن کە لە ئێمە شار دراوە بێ؟)) چوومە دەرەوەو لە پشت دەرگاکەوە ڕاوەستام و چاوم نووساند بە کونی دەرگاکەوە تا تەواوی قسەو هەڵس و کەوتیان بزانم. دواییش بە بیانووی چادانان و بسکویت گێڕانەوە زوو زوو دەچوومە ناو هۆڵەکەشەوە.

هەوای ناو هۆڵەکە زۆر گەرم و ناخۆش بوو بەو بیانووەشەوە پەنجەرەیەکیانم کردەوە تا هەوایەکە بگۆڕێ و خۆشم لە دەرەوە باشتر بتوانم گوێم لە قسەکانیان بێت.

لە پێشدا جەنابی بەڕێوەبەر قسەی کرد: لە سەرەتادا بە نزمی دەدواو ئێمە لە دەرەوە نەماندەتوان تەواوی قسەکان ببیستین. لە دواییدا نەختێك دەنگی لێ هەڵبڕی. دەربارەی ڕەفتارو خوو و ڕەوشتی باوکان و دایکان دەدوا. گلەیی لە ڕەفتاری باوکان و دایکان دەکرد کە لەگەڵ منداڵەکانیاندا باش نین... و بەسەریان ڕاناگەن و بۆ هەموو شتێك هەر ڕوو لە بەڕێوەبەری قوتابخانە دەکەن.





دەیگوت: ((بەر لە قوتابخانە دایکان و باوکان لێپرسراوی خوو و ڕەوشت و ڕەفتاری منداڵانن. چونکە منداڵ یەکەم وانەی ژیانیان لە باوك و دایکیانەوە فێر دەبن. ئینجا دێنە لای مامۆستا)). باوکان و دایکانیش قوتابخانەیان بە کەمتەرخەم دەزانی بۆیە گلەیی و ڕەخنەو چپە لە هۆڵەکەدا دەستی پێکرد.

بەڕێوەبەری بەڕێز لە کۆتایی قسەکانیدا گوتی:

((من یەکجار لە قوتابییەکان نزیکم، تەواوی کاتم هەر خەریکی بەسەر ڕاگەیشتنێیانم بەجۆرێك کە تەنانەت کاتی ئەوەم نییە بەسەر ماڵ و منداڵ و ژیانی خۆشمدا ڕابگەم. کوڕێکم هەیە لە قوتابخانەی ناوەندی دەخوێنێ، لەبەر پڕکاری خۆم ناپڕژێم تەنانەت ڕۆژێك سەرێ لە قوتابخانەکەی هەڵێنم، بەڕێوەبەرەکەی چەند جارێ نامەی بۆ نووسیبووم و داوای چوونی لێکردووم بەڵام تا ئێستا نەمتوانیوە بچم. باشە ئەی ئێوە بۆ بەسەرکاروباری منداڵەکانتان ڕاناگەن، هەر سەرێکیش ناکەن بە قوتابخانەکانیاندا!!))

دوای تەواو بوونی قسەکانی بەڕێوەبەر سەرۆکی ئەنجوومەنی ((باوکان و مامۆستایان)) چووە پشت مێزی قسەکردن و داوای لە دایك و باوکەکان کرد هەرچی شتێکیان لەم بارەیەوە هەیە بیلێن. باوکی یەکێك لە قوتابییەکان مۆڵەتی قسەکردنی وەرگرت و بە دەنگێکی گڕ وەك یەکێکی بێگانە دەستی بە قسان کرد:

((کوڕی من ڕێنووس و دارشتنی لاوازە. لاوەکانمان خوێندن و نووسینی زمانی زگماکیان بۆ نەزانن! و قسەکردنیان ڕێك و پێك نەبێت!))

مامۆستای منداڵەکەی پرسی:

((ئێوە بەچی ڕا دەزانن ڕێنووس و دارشتنی ئەو لاوازو خراپە؟))



((بەچی؟ بە چاوی خۆم دەبینم! منداڵەکەی من ڕستەیەك بە کاتی ئێستا دەست پێدەکا کەچی لە ناوەڕاستیدا دەچێتەوە سەر ڕابووردوو و لە کۆتاییشدا بە داهاتوو دوایی دەهێنێت.

مامۆستای وێژە گوتی:

((قوربان شتی وا هەر نییە!. ئەگەر لە زمانی بێگانەدا خراپ بێ دەتوانین بڵێین ئێ، هەر نەیسە، بەڵام زمانی زگماکی بۆ؟))

باوکی کوڕە بەجارێ هەڵچوو. ئەو قسەکانی پێشەوەی ئەوەندە ڕێك و ڕوون و ئاشکرا نەبوون، و ئێستا کە توورەش بوو ئیدی هەر هێندەی تر بوو.

((کوڕی من وریا زۆر! مامۆستا کەمتەرخەم!))

من قسەی کوڕەکەم ناگەم و دایکیش ناگا! مامۆستاکە پێویست! زۆر کەم، پێویست نمرەی مام ناوەندی پێویست!!

مامۆستای وێژە گوتی:

((ببوورە قوربان من هیچ لە قسەکانی ئێوە تێنەگەیشتم..))

هەموو دانیشتوان بە دەنگێکی بەرزەوە دەستیانکرد بە پێکەنین و منیش بە دەست خۆم نەبوو پڕمەیەکم کرد!. مامۆستا پرسی:

– کە ئێوەو دایکی منداڵەکە لە زمانی ئەو نەگەن من لە کوێ تێیدەگەم؟.

باوکی منداڵەکە وەڵامی دایەوە:

– من دەمەوێ ئەمە. هەر کەسێ لە زمانی منداڵ تێدەگات مامۆستاکەشی تێدەگات!!

دیسانەوە دانیشتوان لەو قسە هەڵلەق و مەڵلەقانەی باوکی کوڕە دەستیان کردەوە بە پێکەنین.





مامۆستا پرسی:

– کوڕەکەتان لە قسەکانی ئێوە دەگات؟

نەخەیر!.

بە گوتنی ((نەخەیر)) ئیتر دانیشتوان نەیانتوانی خۆیان ڕاگرن، قاقای پێکەنین بەرز بووەوەو ڕەخنەو مەتەڵەك لە هەموو لایەکەوە سەری هەڵدا.

بەڕێوەبەری بەڕێز لە ناوەڕاستی قسەکاندا هەستاو داوای کرد کە دوایی بەم باس و گفتوگۆیە بهێنرێ. باوکی منداڵێکی تر ڕاستبۆوە و دەستی بە قسان کرد. ئەویش هەر گازاندەی لە فێربوونی منداڵەکەی بوو و گوتی:

کوڕەکەم وانەکانی لە من دەپرسێ و منیش ناتوانم وەڵامی بدەمەوە. ئەگەر بمویستبایە بۆ خۆم وانەی پێ بڵێم نەمدەخستە قوتابخانەوە.

مامۆستا وەڵامی دایەوە:

ئەگەر ئێوە ناتوانن یارمەتی بدەن گوناهی ئێمە چییە؟ قوتابی لەسەریەتی ئەرکەکانی لە دەرەوەی قوتابخانە ئەنجام بدات و تێبکۆشێ.

باوکەکە توڕە بوو و قیژاندی:

– بەرنامەکەتان هەڵەیە!. شتێك بە منداڵان بڵێن کە فێری بن.

دیسانەوە دانیشتوان پێکەنینەوەو دایکێك لە وەڵامی ئەم پیاوەدا گوتی:

– منداڵەکانمان لە قوتابخانە هیچ فێر نابن!!!. من لە هەر شوێنێکی وانەکەی پرسیاری لێدەکەم نایزانێ!! لەسەردەمی ئێمەدا بەرنامەی قوتابخانەکان زۆر لە ئێستا باشتر بوو. منداڵەکەی من تا هێشتا نازانێ جیاوازی نێوان گیانلەبەری خشۆك و گیانلەبەری چوار پێ چییە!!.

بەڕێوەبەری بەڕێز ئاماژەی ئەوانیشی کرد دانیشنەوەو لە وەڵامیاندا گوتی:



بەرنامەی وەزارەتی پەروەردە لەلایەن کۆمەڵێ زاناو ڕۆشنبیرو شارەزاوە دادەندرێ و دوای خوێندنەوەو پێداچوونەوەی ئەم بەرنامانە ئینجا پێشکێش دەکرێن.

بەڵام ژنە هەروا بە ئاسانی دەستبەردار نەبوو و گوتی:

– ئێمە هەموو شتێکمان لە دەوڵەت دەوێ. منداڵێکی پۆلی پێنجەم هەر نەبێ دەبێ ئەو شتانە بزانێ... ئەمەش هیچ. ئەوان ((دایکان و باوکەکان )) ڕاستەو ڕاست وەك ئەکتەری شانۆگەرییەکی کۆمیدی ڕەفتاریان دەکرد. لە ڕاستیشدا قسەکانیان زۆر ڕاست بوون.

ئەگەر لەبیرت بێ لە پۆلەکەی ئێمەدا قوتابییەکمان هەبوو ناوی ((مراد)) بوو و هەر کاتێ مامۆستا پێیدەگوت:

((هەستە))

دەیپرسی:

((کێ؟))

((تۆ...))

((من دەفەرمووی قوربان؟...))

((بەڵێ کوڕەکە گیان تۆ دەڵێم))

((لەگەڵ منت بوو قوربان؟))

تەنانەت ئەگەر مامۆستا ناویشی ببردبایە، ئەو دیسانەوە هەر دەیپرسی:

((مەبەستتان منم؟))

تا مامۆستا تووڕە دەبوو و دەیقیژاند:





((بەڵێ لەگەڵ تۆمە...))

ئینجا (مراد) زۆر ئارام و لەسەرخۆ ئاوڕی دەدایەوەو بەوەی لە پشتییەوە دادەنیشت دەگوت:

((مامۆستا لەگەڵ تۆیەتی!))

جارێکیشیان کە لە پۆلا دانیشتبوو جگە لە دیوار کەسی لە دواوە نەبوو، دیسانەوە ئاوڕی دایەوەو بە دیوارەکەی گوت:

((بزانە مامۆستا ئیشی چی پێتە!))

ئەو ڕۆژە باوکی مرادیش لەو ئەنجومەنەدا بوو، هەستا و گوتی:

– ئەگەر ڕێگا بدەن منیش دەمەوێ چەند قسەیەك بکەم.

سەرۆکی ئەنجوومەن وەڵامی دایەوە:

– فەرموون قوربان.

هەموو بەلای باوکی مراد دا سەریان سوڕاندو ئەویش زۆر بە سادەیی و لەسەرخۆییەوە پرسی:

– لەگەڵ منتانە!!

سەرۆکی ئەنجوومەن بە زەردەیەکەوە گوتی:

– ئەی ئێوە نەتانویست قسە بکەن!.

– کێ؟

– ئێوە...

– من دەڵێن؟

– بەڵێ جەنابتان!. فەرموون چیتان ویست بیڵێن!.



باوکی مراد دەق وەك کوڕەکەی دەستی بۆ سەرسینگی خۆی برد:

– لەگەڵ منتانە؟

لەناوەڕاستی حەشیمەتەکەی یەکێك ڕاستبۆوە و گوتی:

((نەخێر لەگەڵ منیانە)). دانیشتوان دووبارە دەستیان کردەوە بە پێکەنین!

باوکی مراد دەستی بە قسە کرد:

– یاری فتبۆڵێن لە قوتابخانەدا لابەن و قەدەغەی کەن، ئەم منداڵانە هەمیشە هەر یاری دەکەن و بەسەر وەختی خوێندن و تێکۆشان و ئەرك و مەشقەکانیان ڕاناگەن.

جەنابی بەڕێوەبەر لێیپرسی:

– کوڕەکەت پۆلی چەندەمە؟!!

– هی من؟

– بەڵێ.

باوکی مراد بیری کردەوەو و وەڵامی دایەوە:

– لەم قوتابخانەیە دەخوێنێ!

دەنگی پێکەنینی دانیشتووەکان هۆڵەکەی داگرت و من بە ئەسپایی بە مامۆستاکەمانم گوت:

– کوڕەکەی ناوی مرادە و پۆلی چوارەمە.

باوکی مراد کە دیتی کار لە کار ترازاوە لەسەرخۆ لەجێگای خۆی دانیشتەوە!.

ئینجا یەکێکی تر لە کەس و کاری منداڵەکان دەستی بە قسە کرد:

هێندە بە کەش و فش و خۆبادان و لەسەرخۆییەوە قسەی دەکرد زۆرگران لەمەبەستەکەی دەگەیشترا!: ((بەخێو کردنی مێش هەنگوین لە وڵاتی ئێمەدا زۆر باش و بە سوودە)).

ئەم قسانە هیچ پەیوەندییەکیان بەم دانیشتنەوەوە نەبوو، دانشتوان بە زەحمەت پێکەنینیان زەوت کردو چاوەڕێ بوون بزانن مەبەستی قسەی ئەم کاکە چییە.. یارۆ بێ ئەوەی گوێ بداتە دانیشتوان ماوەیەك دەربارەی سوودی مێش هەنگوین قسەی فەرموو: ((مێش هەنگوین گیانلەبەرێکی بچووکەو بە باڵە جوانەکانی بۆ دوورترین شوێن دەفڕێ و شیلەی گوڵ و گوڵە کێویلکان دەمژێت و هەنگوینی لێ دروستدەکات... هەنگوین بۆ ئادەمیزاد زۆر بەسوودە!... بە قاوەڵتی دەخورێ!... دەشبێت بکرێ بە نیوەڕۆکەو شێو، ڕاوەکەشی زۆر خۆشە... ئێمە دوو جۆر هەنگوینمان هەیە)). لەملاولاوە دەنگی پڕمەو چرپەچرپ و گازاندەو ڕەخنە بەرز بۆوە.

بەڕێوەبەری بەڕێز قسەی کابرای بڕی:

– قوربان مێش هەنگوین چ پەیوەندییەکی بە ئیشی ئێمەوەیە؟

– هەنگوین بۆ ئێمە زۆر بەسوودە!

– زۆر باشە، بەڵام لە قوتابخانەدا چی لە هەنگوین بکەین؟

– ڕاوەستن پێش ماوەیەك یەکێ لە کەسوکاری منداڵەکان ڕەخنەی لەوانە بێ مانایەکان دەگرت. منیش لەگەڵ ئەودام. بۆ نموونە دۆزینەوەی گۆشەی شەست پلەیی بە کەڵکی چی قوتابی دێت؟. لەجیاتی ئەم شتە پڕو پووچانە خراپی چییە پەروەردەی مێش هەنگوین کە ئەم هەموو سوودانەی هەیە فێری قوتابییان بکەین!

پێویستە لە قوتابخانەدا چەند خەڵێفە مێشێك پەروەردە بکەن، تا منداڵان لە نزیکەوە فێری ئەم ئیشە ببن.. قوربان ئێوە بێ ئاگان چەند بە سوودە...



ئەگەر بەخێوکردن و پەروەردەی مێش هەنگوین لە هەموو شوێنێکدا بڵاوببێتەوە ئابووری وڵات زۆر بەرز دەکاتەوە. ئەم ئیشە تەنانەت لە ئاژەڵداریش زۆر چاکترە.

ئاژەڵ کاو جۆو ئالیك و شوانی دەوێ، بەڵام مێش هەنگوین نە گەوڕو نە شوان و گاوان و نەکاو نەجۆ هیچی پێویست نییە. ((ساڵانە پڕی یەك کوورە هەنگوین دەدات)).

یەکێکی تر ڕاستبۆوەو گوتی:

– سکاکی بەڕێز تۆ ڕاست دەکەی بەڵام خۆ لە شاردا ناتوانرێ مێش هەنگوین بەخێوبکرێت، ئەی نابینن ئەو دووکەڵەی لە لوولەی سۆپاکانەوە دێتە دەرێ هەوای شاری چۆن ژەهراوی کردووە؟. ئادەمیزاد بە زۆرە ملێ لێرە دەژیت. ئیتر مێش هەنگوین چۆن دەتوانێ بژیت. مێش هەنگوین هەوای پاك و گوڵ و گیای دەوێ لە شاری پیس و پڕ دووکەڵدا مێش هەنگوین لە جیاتی هەنگوین قیڕو گازوایل دەردەدات!. دانیشتوان بە دەنگی بەرزەوە دەستیان کردەوە بە پێکەنین و دەنگی ((دەستخۆش... دەستخۆش..)) لە هەموو لایەکەوە بەرز بۆوە!.

قسەکەر گوتی:

– من پێشنیارێکی ترم هەیە. ئەگەر منداڵەکانمان پەلەوەر بەخێوکەن تەواوی ئەم تەنگوچەڵەمانە لەنێو دەچن. بەڕێوەبەری بەڕێز کە تەواو وەڕەز بوو بوو. بەتووڕەییەوە قسەکەی ئەوی بڕی:

– کاکی بەڕێز لەپێشەوە پێم ڕاگەیاندن کە ئێمە ناتوانین بەخێوکردنی مێش هەنگوینە و ئاژەڵ و پەلەوەر فێری منداڵان بکەین، ئێمە ئەوەمان لەسەرە بەرنامەی وەزارەتی پەروەردە ئەنجام بدەین.. ئێرە ((قوتابخانەی سەرەتاییە نەك کۆلیژی کشتوکاڵ)).

ژنێکی لاو و جوان کە زۆریش شیك و ڕێك و پێکیش بوو هەستاو گوتی:

– زۆر لە باسەکە دەرچووین. من بەناوی ئەندامێکی ئەنجوومەنەوە پێشنیارێکم هەیە. لە قوتابخانەدا چ بیرێکتان لە منداڵە هەژارەکان کردۆتەوە؟ چۆنە یانەسیبێك پێك بێنین.. یا وەکو پار ئاهەنگێکی مۆسیقایان بۆ بگێڕین!))

دوای گفتوگۆیەکی زۆر بریار درا شەو دانیشتنێك ڕێك بخەن. بۆ ئامادەکردنی، پێشەکی ئەو یارمەتییەی قوتابییانی هەژاریش دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی پارەو پیتاك لە دایك و باوکان. دایك و باوکان لە دەوری مامۆستایانی منداڵەکانیان کۆ ببوونەوەو دەربارەی خوێندن و مەشق و وانەکانیان پرسیاریان دەکردو ئێمەش بە نیشانەی خزمەتکردنێوە دەستمان بە گێڕانی سینی شیرینی و ساردەمەنی کرد بەناو میوانەکاندا.

بەڕاستی ئەو ڕۆژە خۆش گوزەرا. چەند خۆشە هەموو ڕۆژێ ئەنجوومەنی باوکان و مامۆستایان بگیرێت تا ئێمەش تاوێك بە خۆشی ڕابوێرین. من دایکم لەجیاتی باوکم هاتبوو. کاتێ ئەو ڕۆژە گەڕاینەوە ماڵێ پێم گوت:

دایە تۆ بۆ قسەیەکت نەکرد؟.

– ڕێی منیان نەدا.. هەر لەسەرەتاوە بە قسەی پڕو پووچیان دەستپێکرد و ماوەی دانیشتنەکە تەواو بوو و قسەی چاکیش مایەوە بۆ دانیشتنێکی تر!

پرسیم:

بۆ دایە قسەی چاکت دەزانی بیانکەی؟

– بەڵێ... دەمویست پێشنیار بکەم وانەی دروومان و چێشت لێنان فێری منداڵان بکەن... بە زەحمەت ددانم بە خۆمداگرت تا پێنەکەنم، چونکە دەمزانی ئەگەر پێبکەنم دایکم سزایەکی باشم دەدات. باشە تۆ بی و خودا



لە قوتابخانەیەکدا کە کور و کچ پێکەوە دەخوێنن فێرکردنی وانەی چێشت لێنان چۆن دەگونجێ؟

ئەحمەد گیان هەر چەندە نامەکەشم زۆر دوورو درێژ بوو داوای لێبووردن دەکەم.

سڵاوم بە هەموو ئاوەڵەکان بگەیەنە.

**سەرکەوتنت لە خوا دەخوازم**

**زەینەب یالکەر**





# مندالە بلیمەتەکان

ئەستەمبۆڵ 12ی مارتی 1967

زەینەب:

کاتێ کە نامەکەتم دەخوێندەوە هەروەك تەماشای فلیمێکی سینەمایی بکەم هەموو بیرەوەرییەکانی سەردەمی قوتابخانەکەم لەبەر چاوان قوت بوونەوە، باوکم هیچ کاتێ ناچێتە کۆبوونەوەی باوکان و مامۆستایان. چونکە کاتی نییە، شەوانە کە درەنگ لە کارخانەوە دێتەوە هێندە ماندوو و شەکەتە تەنانەت تاقەتی قسە کردنیشی نییە، جا چ جای ئەوەی هاوبەشی کاروباری کۆمەڵایەتی بکات، دایکی بێ چارەشم هێندە بە ئیش و کاری ماڵەوە خەریکە تەنانەت وەختی چوونە ماڵی دراوسێیەکیشی نییە!. ئێستاش دەمەوێ هەواڵێکت دەمێ: ((ئەمجارە بلیمەتەکەی ئێمە یەکەم بوو!))

باوەڕ ناکەم لە مەبەستەکەم گەیشتبی. دەزانی بلیمەتەکەی ئێمە کێیە؟

فاتێی خوشکمە کە ئێستا نازناوی بلیمەتی وەرگرتووە!.

یەکشەممەی ڕابردوو شەش بلیمەت هاوبەشی پێشبڕکەیەکیان کردو لەگەڵ ئەوەشدا داوەرەکانی پێشبڕکێیەکە هەموویانیان وەکو یەك ناساندن بەڵام بەلای منەوە ئەوەی ئێمە یەکەم بوو!.. من دوو مامم هەیە یەکێکیان دوو منداڵ و ئەوەی تریان منداڵێکی بلیمەتیان هەیەو هاوکارێکی باوکیشم کە ئەندازیارە بلیمەتێکی هەیەو دراوسێیەکانیشیان هەریەکەو بلیمەتێك. کە تێکڕای هەموویان دەکەنە شەش: خوا ڕەحمی کرد کە هەموو دانیشتوانی گەڕەك بەمەیان نەزانی دەنا بلیمەتەکان ژمارەیان لە دە هەزاریش تێدەپەڕی!. خۆ هەر



نەبێ بەلای کەمەوە هەر خێزانەی بلیمەتێکی هەر هەیە، و هیچ ماڵێکیش نییە بلیمەتێکی تێدا نەبێ!.

مامە گەورەکەم خوو و ڕەوشتێکی هەیە لەهەر دانیشتنێك و ئەنجومەنێکدا بێ ئەوانەی چواردەوری پەیوەندی و قسەیان بەهەرچییەکەوە هەبێ، ئەو گرگرٍ دەیهێنێتەوە سەر پەروەردەو خوو و ڕەوشتی منداڵان و دەست بە باسی منداڵەکانی خۆی دەکا... هەر کاتێ کە دێتە ماڵی ئێمەش ئیدی ئەوە باس هەر باسی منداڵەکانیەتی!.

((دەزانن پەروێزە چکۆڵە چی کردووە؟ بەخودای جێی باوەڕێ نییە.. شەو کە لە کارگە گەڕامەوە... بە ڕاکردن ڕۆیشت و نەعلەکانی هێنان و خستنیە بەر پێم... دەسا وەرە منداڵێك لەم تەمەنەدا ئەم ئیشانە بکات؟

سەرسوڕمانی ناوێ؟! وەرن خۆتان سەیری ئەم بیرو هۆشەی کەن!.

ئەمە منداڵێکی لە عادەت بەدەرە!.

ئەو منداڵەی کە مامیشم هێندەی پێدا هەڵدەدا دەزانی چەندساڵانەیە؟ ساڵێك لە فاتێی ئێمە گەورەترە. دوو سێ شەو لەمەوپێش هەموو لایەك کۆ ببووینەوە، هەر لەگەڵ مامم دەستی بە پێدا هەڵدانی کوڕەکەی کرد کابرایەکی ئەندازیار کە لەگەڵ باوکمدا لەکارخانەیە خۆی پێ ڕانەگیراو قسەکەی مامی بڕی:

منداڵی ئەم سەردەمە هەموویان وان. منداڵەکەی من هێشتا سەرەتایی تەواو نەکردووە کەچی زمانی فەرەنسی وەك بلبل قسە دەکا!.. ئیدی ئەمە نیشانەی بلیمەتییە..

مامم وەڵامی دایەوە:

- فێربوونی زمانی فەرەنسی نیشانەی بلیمەتی نییە...





–  ئەدی چی نیشانەی بلیمەتییە؟ بەلای تۆوە هێندە ئاسانە منداڵێکی سەرەتایی بە فەرەنسی قسان بکات؟.

–  کەواتە ئەگەر وابێ هەموو منداڵە فەرەنسییەکان بلیمەتن!.

ئەندازیار ڕقی هەستاو بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

–  کاکە بۆ خۆت هەڵە دەکەی؟ منداڵێکی فەرەنسی کە زمانی زگماکی خۆی قسە دەکا لەگەڵ منداڵێکی تردا کە لەبەر بلیمەتی خۆی فەرەنسی فێربووە جیایە.

مامی گەورەشم کە لە هەلێك دەگەڕا تا بە منداڵەکەی خۆیدا هەڵبدا هاتە نێوێ و گوتی:

–  منداڵە بچووکەکەی من لە گەورەکەشم لەپێشترە. هەموو دەزانن کە گەورەکە بلیمەت بوو بەڵام ئەمەیان لەویش سەیرترە!.

چەند شەوێ لەمەوپێش کە هاتمەوە ماڵێ دایکی گوتی: ((ئیدی من ناتوانم ئەم نێرەکەرە لە ماڵەوە ببەستمەوەو چاودێری بکەم و سەری لە سەریدەم، بە قسەم ناکا... دەڵێم لە دەرەوە یاری مەکە چی خراپە پێم دەکا.. ئەوە چۆتەوە کۆڵانێ.. تاوێکی لێگەڕام تا دیتمەوە.. دەبینم لەبەر تۆپێنێ لە ئارەقەیدا شەڵاڵ بووە.. گوتم:

((وەرەوە ژووری)).

نەهات. ڕامکرد بیگرم بۆم نەگیرا! هێندەی بە خێرایی ڕادەکرد تۆزی پێشیم نەدەشکاند.. کوڕێژگە نیو ئەوەندەی منیش نابێ ها!.. بەڵام دەگیرێ!. بلیمەتە.

دراوسێیەکمان گوتی:

–  کچەکەی منیش وایە.. هەر بلیمەتێکە بۆ خۆی!.



لەم کاتەدا مامی گەورەم دووبارە دەستی بە قسان کردەوە:

–  شەکرتان لە دەما بێ. خەریك بووم داستانی کوڕەکەمم دەگێڕایەوە.

بە کورتی هەرچی من ڕامدەکرد ئەو زیاتر لۆچی لەخۆی دەبڕی. هەرچیم کردو کۆشا نەمتوانی بیگەمێ لە دواییدا قیژاندم: ((بوەستە ئەگەر بتگرم خراپت پێدەکەم ها!)) گەڕایەوە، دەزانی چی گوت؟. ((تۆ کێی فەرمانم پێدەکەی! بۆ تۆ دایکمی!)). دەوەرن توخوا سەیری ئەم لۆژیکە بکەن!. خۆم بۆ نەگیرا، پێکەنین گرتمی. پیاوی گەورەش ناتوانێ قسەی وا بکات!.

مامی گەورەم لەگەڵ پێدا هەڵدانی کوڕەکەشیدا چاوی بڕیبووە قەدو باڵای ئەو و زەردەی شانازی لەسەر زاری لا نەدەچوو! ئەوانیدیش بۆ ئەوەی شێواز تێك نەچێ زەردەیان دەهاتێ. کاکی ئەندازیار بە مامی گوت:

–  منداڵی ئاخر زەمان هەموو بلیمەتن!.

مامم دەستی ئەشەدو بیللای بۆ لە ملی دا.

–  بەڵێ ماشەڵڵا کوڕەکەی تۆش هەر بلیمەتە.

ئەندازیار هێندە بە قاقای بەرزەوە پێکەنی ئاوی لە چاوان زا.

–  بەڵێ، بەم بستە باڵایەیەوە هەموو ئیش و کاری ماڵەوە لەسەر شانی ئەوە.

دراوسێیەکەمان کە قسەکەی بە نیوەچڵی دەزاریدا مابۆوە گوتی:

–  کچەکەی من هەر لە ئێستاوە هونەرمەندێکی شێوەکاری تەواوە! ئەگەر ئەو نیگارانە ببینن کە دروستیکردوون هەر سەرتان سوڕدەمێنێ.

دایکی دەستی بۆ قسەکانی مێردەکەی لەملی دا:

–  دەترسم لە چاوی بەرن!





مامی بچووکم گوتی:

نازانم حیکمەتێکی تێدایە تەواوی منداڵی ئەم سەردەمە بلیمەتن... ئینجا یەکسەر دەستی بە پێداهەڵدانی کوڕەکەی خۆی کرد:

– نازانن کوڕەکەی من چ گۆرانی بێژێکە..

باوکیشم کە لەو مەیدانەدا لەو کەمتر نەبوو گوتی:

فاتێی ئێمە لەم تەمەنەدا دەیەوێ ببێتە ((بالرین))

تویست دەڵێن... هەرچی دەڵێن... سەمایەك دەكا مرۆڤ واقی وڕدەمێنێ!
دایکم ئەم پێداهەڵدانەی باوکمی بەدڵ نەبوو:

– من هەرگیز نایەڵم ببێتە (سەماکەر).

بابە بە تەوسەوە گوتی:

خانم تۆ هەڵەی.. سەماکەر شتێکە.. بالرین شتێکی دیکە.. کچی ئێمە دەبێتە بالرین، بالیە هونەرێکی گەورەیە لە هونەرەکان.

– هەرچی هەیە کەیفی خۆیەتی... ئەی نابێ لەبەر چاوی ئەم و ئەو خۆی ڕووت کاتەوە.. من ناهێڵم گفتوگۆی ئەم ژن و مێردە بەلای منەوە دەزانی چۆن بوو؟ ڕاست وەك ئەوە وابوو كوڕێكی دە ساڵان هەستێ و بە دایك و باوكی بڵێ ((من ژنم دەوێ!))، كچۆڵە هێشتا ڕۆینی ئاسایی نازانێ تا بوونە ((بالرین))ی كەچی دایك و باوكەش وا خەریكی هەراو چەنە چەنەن لە سەری!.

لەهەموو شتێ خۆشتریش قسەی ژنە دراوسێیەكەی ئەندازیارەكە بوو كە نەیهێنا و نەیبردو یەكسەر گوتی:

– منداڵەكەی من بە ساڵ و نیوێك سەر پێ كەوت!.



زۆرم سەر سوڕما... باشە ئەگەر منداڵێك بە ساڵ و نیوێك پێ نەگرێ دەبێ چی بێ؟.. منداڵ هەرچی بكات دایك و باوكەكان دەڵێن بلیمەتە..

دوای چەند دەقیقەیەك ژوورەكە لەبەر هات و هاوارو دەنگە دەنگ و زەنای منداڵە بلیمەتەكان دەتگوت نەخۆشخانەیە!. ئەندازیارەكە كوڕێكی هەیە ناوی ((تاریق))ە و قوتابی پۆلی دووەمی ناوەندییە.

باوكی گوتی: ئەم تاریقەی من كە منداڵ بوو بلیمەتێك بوو بەڵام كە گەورە بوو بلیمەتییەكەی نەما!

مامی چكۆڵەم پرسی:

– بلیمەتییەكەی چی بوو؟

كاتێك كاكی ئەندازیار خەریكی پێداهەڵدانی كوڕەكەی بوو من سەیری جووڵانەوەو ڕەفتاری تاریقم دەكرد. بەستەزمانە بە منداڵی ئەوەندەیان لێدابوو ماتی و گێژیەتی لە ڕەفتاریدا بە ئاشكرا دیار بوو. دایكی چەند جارێك لە حەسارێوە بانگی كرد:

((تاریق.. تاریق..)) جاری چوارەم و پێنجەم ئەو تازە سەری لە پەنجەرەوە دەبردە دەرێ و بە دەنگێكی نزم وەڵامی دەدایەوە: ((هەم؟. چیە؟.))

ئێستاش ئەو منداڵە بەم سەرو كەللەیەوەو بەو ڕەفتارەوە هاوبەشی پێشبڕكەی ((منداڵە بلیمەتەكانی)) كردووە، مامی گەورەم نەیتوانی خۆی ڕاگرێ و بە كچە پێنج ساڵانەكەی خۆی گوت:

– یاڵڵا گۆرانییەك بڵێ تا ببینین چەند خۆشی دەڵێی.. كیژۆڵەكە تۆزێك بە چەپ و ڕاستدا هات و بەنازو نوزێكەوە خۆی هێناو بردو دەنگێكی تا بڵێی سەیری لێوە هات.

مامم دووبارە گوتی:





– یاڵڵا کچی خۆم.. خێراکە کچە جوانەکەم. بزانم.. هونەری خۆت بنوێنە!.

کچۆڵەکە قامکی لە کونە لووتی خۆی نا.

– نازانم بیڵێم! نایڵێم!

مامۆژنم گوتی:

– منداڵەکانی ئێمە ئامادەییەکی سەیریان لە فێربوونی مۆسیقادا هەیە. هەردووکیان پیانۆ لێدەدەن... ئەگەر پیانۆیەکی لێدەبوو کوڕەکەم دمبگێکی خۆشی بۆ لێدەدان.

– مامم دەستوبرد قسەی ژنەکەی ڕاستکردەوە:

دمبگ نا.. ئاهەنگێکی دەگێڕا.

چووزانم دمبگ.. مبگ.. چیە.. ئەو شتانەی لێدەداو ئەهە.. من خۆشم کە کچ بووم هەر ئەوانەم لێدەدا!

سەرلە نوێ ژن و مێردە کەوتنەوە گیانی کچۆڵەکە گۆرانییەك بڵێ! بەڵام کچۆڵەی هەناسە سارد خوێن لە لەشیا وشك ببوو و تەنیا وەك کۆنە مزگەرەکانی پێشوو هەر خۆی بەولاولادا بادەدا.

دایکی گوتی:

– ئەگەر نەیڵێی جلە جوانەکانت دەدەمە کچی دراوسێکەمان!

کچۆڵەکە زۆر بە سادەیی و لەسەرخۆییەوە وەڵامی دایەوە:

– جا بیاندەیە... هەر نامەوێن.

هەرچەندە دایك و باوکە لێی دەپاڕانەوە... منداڵە زیاتر دەچۆوە قەپێلکێ..

مامم گوتی:



– ئەگەر گۆرانییەك بڵێی چکلێتت دەدەمێ..

مامم سینییەکی تاودایەو دەستی بە سینی لێدان کرد.

مامۆژنیشم سەری سینی لێدانی گەرم بوو، و دەنگێکی گڕ و ناساز لە گەرووی کچۆڵەوە هاتە دەرێ، بەڵام نەزانرا چ دەڵێ... هەڵبەستە دەیخوێنێتەوە یا هەر لەخۆیەوە مزەمزیەتی!.

هەر کە بێدەنگ دەبوو مامۆژنم دەگەیشتە فریای.. زیکەی دەنگی مامۆژنم هێندە تیژ و ناخۆش بوو دەنگی چۆلەکەی تێدا وون دەبوو! ئاوازی گۆرانی گوتنی مامۆژنم ئاوازێکی ناخۆشی ناشییانەی ئەوتۆ بوو کە هەر دەبایە پێی پێبکەنی. بەتایبەتی کە جار جارەش بە هەوای گۆرانییەکە خۆی بادەدا:

((کەم بێ و کەم بچۆ کەم خۆت بنوێنە... کەم بە تیلەی چاو جەرگم دەربێنە))

کاتێ ئاهەنگی گۆرانی تەواو بوو مامم و مامۆژنم لە پێش هەمووواندا دەستیانکرد بە چەپڵە لێدان.. ئەوانی دیش لە شەرمی ڕووان ناچار بوون دەستیان بە چەپڵە لێدان کرد!

مامۆژنم بە ژنی ئەندازیارەکەی گوت:

– کیژەکەم سەرمای بووە، دەنگی باش نایە، دەنا دەتاندیت چی دەکرد.

ژنی ئەندازیارەکە کە پێکەنینێکی نا بە دڵانەی بۆ کردو وەڵامی دایەوە:

– ببورە، زۆر چاکی گوت، بەڕاستی دەنگی خۆشە! خوا لە چاوی پیسی بە دوور کات!

مامی بچووکم دەمار گرتی و بە کوڕەکەی گوت:

– باڵڵا تۆش گۆرانییەك بڵێ تا بزانن گۆرانی گوتن چۆنە!.

کورپێژگە خۆی بە دیواریەوە نوساندو دەستی بەنازو نوزو خۆهێنان و بردن و خۆ بادانێ کرد!

مامم بە گرژیەکەوە گوتی:

– دە..ی.. کورە... شتێك بڵێ.

هەرچەند هەوڵیاندا سوودی نەبوو!. مامم توورە بوو و قیژاندی:

– دەی.. تووڵە سەگ.. بەشکو خوا بکا لەگەڵ ئەمەدا گیانت دەرچێ!

ئامۆزاکەم لە بۆرەی گریانێیدا! چڵمی لووتی و ئاوی چاوی تێکەڵ بوون!. لەکاتێکدا هەنیسکی دەدا — بەدەم هەنیسکانەوە دەستی بە گۆرانی کرد. باوك و دایکیشی لەگەڵ ویدا دەستیان پێکرد!

ئامۆزاکەم لە هەموو سەرو بەندێکدا ڕادەوەستا و ئەویدیکەی لەبیر دەچۆوە. مامم سەربەندەکانی دەگوتنەوە و مامۆژنیشم دواییەکانی.. لە ڕاستیدا ئامۆزاکەم هەر دەگریا و مامم و مامۆژنم گۆرانییان دەگوت! لە ناوەڕاستی گۆرانییەکاندا ئامۆزاکەم وەك دەرزی سەرقەوانی گرامافۆنێك وابوو کە گیر دەبێ:

((پشیلەکەم.. پشیلەکەم.. پشیلەکەم..))

مامم وەك بازرگانێك کە زیانێکی گەورەی کردبێ لە کاتێکدا پیشی دەخواردەوە نەڕاندی:

((دوای پشیلەکەم چییە؟)).

ئامۆزاکەم دیسانەوە دووبارەی دەکردەوە:

((پشیلەکەم.. پشیلەکەم)).

مامۆژنم میهرەبانانە پرسی:



– کوڕی خۆم ئەمڕۆ چیت لێقەوماوە؟ دەڵێی نەخۆشی؟

ئامۆزاکەم لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆری لەخۆی دەکرد پاشماوەی شیعرەکەی وەبیر هەرنەهاتەوەو دیسانەوە دەستی پێکردەوە:

((پشیلەکەم.. پشیلەکەم.. پشیلەکەم..))

مامم وەك گورگی بریندار لووراندی:

((توتکە سەگ بۆ تۆ چەند پشیلەت هەیە؟)).

میوانەکان هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین، بەڵام ئامۆزاکەم هێشتا هەر خەریکی دووپاتکردنەوەی:

((پشیلەکەم.. پشیلەکەم.. پشیلەکەم)) بوو.

مامم کە لە داخا هەر نەمابوو و ئارەقەی وەك بارانێ بە سەرو چاواندا دەهاتە خوارێ، بەهێزتر نەڕاندی:

((بێدەنگ بە. گ. گ. وو. گوو))

مامۆژنم بە هانای کوڕەکەیەوە هات:

((تۆ بە یەکجاری سەرت لە کوڕەکە شێواند! هێندەت بەسەردا شیڕاند ناوی خۆی لەبیر چۆوە)).

ئامۆزاکەم هێشتا هەر ((پشە.. پشە))ی! بوو لە پڕ وەك ئۆتۆمبێلێکی لەقوڕێدا چەقیو بەنزینی بدەیتێ و دەرپەڕێ، مێشکی کرایەوەو شیعرەکەی وەبیرهاتەوەو دەستی پێکرد:

((پشیلەکەم شیرە خۆرەیە!)).

بەڵام دیسانەوە ئەوەی دیکەی لەبیر چۆوەو هاتەوە سەری دێڕێ.

((شیره خۆره. شیره خۆره))

مامۆژنیشم که شتێکی وەبیر هاتبۆوه کەوتەوه یارمەتی دانێی:

((میاو..)

ئامۆزا دەستوبرد دووپاتی کردەوه:

((میاو..))

بەڵام ئەوەیدی نەدەزانی و چاوی لە چاوی دایکی بڕیبوو تا هەرچی ئەو بیڵێ ئەویش بیقۆزێتەوه. دایکی کە نەیدەویست ئەوانیدی پێ بزانن و ئاگادار بن بە لێوان گوتی: ((دیسانەوه..))

ئامۆزا وەبیری هاتەوه:

((دیسانەوه دەیەوێ. چی دەوێ؟))

مامم لە هانای هات: ((شوێنی چۆڵ))

ئامۆزا:

((پشیله بەڵەکەم!.. ناتوانێ نان بخوا... مشك... مشك... مشك..)). سەرلەنوێ هاتەوه سەری دێڕێ: کاتێ میوانەکان دایانە قاقای پێکەنین مامم نەیتوانی خۆی ڕاگرێ نەڕاندی:

((بڕۆ ون بە لەبەر چاوم. جاشەکەر!!!))

مامۆژنم لە شەرمان وەك هەڵووژەی سوور هەڵگەڕاو بە ناڕەزاییەوه گوتی:

((بۆ منداڵەکە سەر کوێر دەکەی؟ ئەوه لەبیری چۆتەوه. خۆ هەڵەی قورئان نییه)).

خێزانی ئەندازیارەکە لەبەر مامۆژنم گوتی:



((منداڵەکە سەری لێ شێوا))

کاتێ میوانەکان دەستیان بە چەپڵە لێدان کرد بۆ ئامۆزایەکەم ئەو خەریکی فرمێسك سڕین بوو بە سەردەستەی کراسەکەی و لە دەرگایەکەوه چووه دەرێ.

دراوسێیەکەمان کە دەیگوت ((کچەکەی وێنە و نیگارکێشێکی بلیمەتە)) گوتی:

کچەکەم بڕۆ وێنەکانت بێنەو پێشانی میوانەکانی بدە.

کچە بەنازو ئەداوە وەڵامی دایەوه:

- ئەگەر ڕەنگ هەبێ هەر ئێستا لێرە یەکێك دروستدەکەم.

باوکم ئاماژەی منی کرد:

- کوڕە ڕاکە بڕۆ ڕەنگەکانت بێنە.

هەرگیز دڵم نەدەهات ئەو ڕەنگە جوانە خۆشەویستانەم کە سەری ساڵی تازە باوکم پێشکەشی کردبووم بیانهێنم و بیاندەم بەوە بەڵام چارەم نەبوو.

چووم هێنامن و لە پێشیم دانان.. کچە چووە پشت مێزو دانیشت و دەستی بە کاغەز ڕەنگ کردنێ کرد. چاوم بەرایی نەدەدا ڕەنگە خۆشەویستەکانم ببینم ئەوها خەساریان بکەن.. لێی دوور کەوتمەوه.. کچە بە قەڵەمدادەر کەوتبووە گیانی ڕەنگەکان، و منیش لە ڕقا ددانەکانم وا لە چیڕەوه بردبوون هەموویان کەتبوونە زیڕە.

کاکی ئەندازیاریش بۆ ئەوەی گەرموگوڕی دانیشتنەکە لەبەین نەچێ لەگەڵ کچەکەی خۆیدا دەیگوت زمانی فەرەنسی وەك بلبل دەزانێ، دەستی بە قسان کردو شتێکی بە کچەکەی گوت: ئەویش وەڵامی دایەوه: ((وی!)) دیسانەوه ئەندازیار شتێکی دیکەی گوت.. کچە دیسانەوه وەڵامی دایەوه: ((وی!))

هەرچی باوکی دەیگوت.. کچە هەر وشەی ((وی))ی دووپات دەکردەوه!.

دوای قسەیەك كە كردی و ((وی))ی بە دوادا هات ئەندازیارەكە گوتی:

– كچێ. خۆ ئەمە ((وی))ی ناوێ!

كچە وەڵامی دایەوە:

– ئەی چییە؟ ((نۆ؟)) گەیشتووینە نۆ؟.

– بەڵێ.. دەبێ بڵێی ((نۆ)) ئێستا نۆرەی ((نۆ)) هاتووە!

ئەمجارەیان ئەندازیار هەرچییەكی دەپرسی، كچە وەڵامی دەدایەوە ((نۆ..)) زۆرم هەوڵ دا ئەو شتانەی كە ئەندازیارەكە دەیگوتن لەبەریانكەم بۆتی بنووسم بەڵام هیچیان تێنەگەیشتم!.

لەپڕ ئەندازیار ڕستەیەكی گوت ماناكەی وا دیار بوو ئەوەبوو كە ((دەرگاكە داخە)) كچە هەستا پەنجەرەی كردەوە خێزانی ئەندازیارە گوتی:

– ئافەرین... كچم..

كە ئەندازیارەكە دیتی گەندەی ئیشەكەی وەدەركەوت و دانیشتوان بە هەڵەی كچ و ژنەكەیان زانی لەسەرخۆ بە ژنەكەی گوت:

– نەء خۆشەویستەكەم هەڵەی كرد.. گوتم ((دەرگاكە داخە)) ژنی ئەندازیار بەرپەرچی دایەوە:

– نەء هیچ هەڵەی نەكرد... زۆر چاكیش بوو.. تۆ هەڵەت كرد!..

لەم بارەیەشەوە شەڕە چەقە كەوتە نێوان ئەندازیارو ژنەكەیەوەو ئێستاو ئەو ساش نەمزانی ئەندازیارەكە ڕاست بوو یا ژنەكەی!

خێزانی ئەندازیارەكە بە مێردەكەی گوت:

– وا دەزانی هەر تۆ فەرەنسی دەزانی؟!!. من بێجگە لەوەی لە قوتابخانە فێری فەرەنسی بووە وم چوار پێنج ساڵیش لە پاریس بوو وم!.



ئەندازیار برۆیەكانی هێنانەوە یەك و گوتی:

– ئا، خۆ لە فەرەنسا پێكەوە بووین.

ژنی ئەندازیاری پێكەنی:

– ئاها.. خۆ لەبیرمە! ها ڕۆژەكەی دەتویست سوتیانێكم بۆ بكڕی ناوەكەیت نە دەزانی و ناچار بووی بە ئاماژە لە كابرای دوكانداری بگەیەنی، ئەویش چوو جانتای ڕاوێی هینا! ؟

ئەندازیار نێوچەوانی تێكنا و گوتی:

– بەسە ئیتر!. تۆ فەرەنسی و ئەڵمانی تێكەڵ و پێكەڵ دەكەی! ئەوێ ئەڵمانیا بوو ویستم شت بكڕم. كاتێ من بە فەرەنسی قسە دەكەم هەموو فەرەنساوییەكان واقیان وڕدەمێنێ!.

بۆ ئەوەی شەڕە چەقەی ئەو ژن و مێردەی ببڕێتەوەو خوانەخواستە كاریان نەگاتە دادگاو تەڵاق و مەڵاق ڕوونەدا! باوكم باسی نیگاركێشی بلیمەتی هێنایەوە گۆڕێ و لە كچەكەی كە هەموو دەست و دەم و چاو و جلەكانی ڕەنگ كردبوو پرسی:

– كچی خۆم تەواو نەبوو؟.

– بەدی چۆن مامە گیان؟

میوانەكان كە تێكڕا گوێیان دابووە قسەكانی ئەندازیارو خێزانەكەی و لە بیریان چوو بۆوە كە كچێكی بلیمەتی دیكە خەریكی تاقیكردنەوەی نیگاركێشانە ڕوویان بەلای ئەودا وەرگێڕایەوە.

دایكی كچە بە دیتنی دیمەنی نیگاركێشی بلیمەت قریشكاندی:

– ئای.. وای.. کچێ.. خوا کوێرت کا! جلەکانت بۆ تێوەرداوە؟ خۆ ئەوانەم دوێنێ بۆ کڕیوی! منداڵی نیگارکێش بەبێ ئەوەی گوێ بداتە قسەکانی دایکی کاغەزەکەی ژێر دەستی بەرزکردەوە کە لەجیاتی وێنە و نیگار چنگێك ڕەنگی تێکەڵ و پێکەڵی بەسەر یەکدا ڕشتبوو. هیچ یەکێك لە دانیشتوان شتێك لەو شاکارە گرنگە تێنەگەیشتن بەڵام کچە خۆی بە پۆزێکەوە کاغەزەکەی بەرزکردبۆوەو پێشانی دەدا هەروەك شاکارێکی لە وێنەکانی ((ڤانکوخ)) و ((ڕامبراند)) و ((بیکاسۆ)) باشتر دروستکردبێ.

ئەندازیار لەپێش هەمووواندا وەقسە هات:

– ماشەڵڵا... هەزار ماشەڵڵا.. دەستخۆش... ئافەرین..

لەوەش سەیرتر ئەوە بوو کە باوکم لە ئەندازیارەکەشی زیاتر بە کچەدا هەڵدا. بەڵام ئەوانیدی بە تۆپزی دانیان بە خۆیاندا گرت تا پێکەنینیان نەیەت.

ئیستاش نۆرەی فاتێی ئێمەیە کە دەبێ هونەرەکەی بنوێنێ. ڕاستییەکەشی گۆی پێشبڕکێی لە هەموان بردەوە!

باوکم گوتی:

کچی من لە دوا ڕۆژدا دەبێتە بالرینێکی ناسراو. یاڵڵا کچکەم تویستێك بکە تا مام و پوورەکانت ببینن و خۆشحاڵ بن.

فاتێ چووە سوچێکی ژوورەکەوە و خۆی مات کرد و دەستیکرد بە نینۆك قرتاندنێ.

باوکم بەرزتر گوتی:

– یاڵڵا کچەکەم. وەرە ناوەڕاستێ..



ئینجا بۆ ئەوەی فاتێ ڕووی بکرێتەوە، باوکم لەسەر ئەو کورسییەی لەسەری دانیشتبوو دەستیکرد بە سوڕدان. دوای ئەویش ئەندازیارو ئینجا ژنەکەی دەستیان پێکرد!

باوکم کە بەدەم تەنەکە لێدانەوە گوتی:

– یاڵڵا کچێ. تۆش وەرە ناوەڕاستێ و هونەرەکەت بنوێنە.. فاتێ وەك لە دزیدا گیرابێ ملکەچ ڕاوەستا بوو و تا دەهات زیاتر خۆی بە دیوارەکەوە دەنووساند..

کاتێ دایکم پاڵی پێوەنا بێتە ناوەڕاستی ژوورەکە و سوڕبدا هەموو شتێك وەدەرکەوت و تێگەیشتین کە بۆچی منداڵەکە لە جێی خۆی ناجووڵێ.

دایکم قیژاندی:

– ئەی هاوار.. خاکی دنیام بەسەری.. خۆ خۆی پیس کردووە!.

دایکم فاتێی هەڵگرت و بردییە دەرەوە تا پاکی بکاتەوە!.

باوکم کە لە شەرما هەموو لەشی وەسەر ئاو گەڕابوو گوتی:

– ئەم منداڵە قەتی وا نەکردووە... نازانم چۆن بووە؟!

خێزانی ئەندازیارەکە بە دەنگێکی تایبەتییەوە وەڵامی دایەوە:

– منداڵە ئیدی! هەموو منداڵێك ئەم جۆرە شاکارانە دەکەن!.. بێگومان لە شەرمان وای لێهات. بەڵێ زەینەب گیان پێشبڕکەی بێ وێنەی منداڵە بلیمەتەکان ئاوا تەواو بوو، بەلای تۆوە فاتێی ئێمە قارەمانی ئەم پێشبڕکەیە نییە؟ بەلای منەوە وایە!

دوای ڕۆیشتنی میوانەکان بە باوکم گوت:

((من ڕستەیەکم لە کتێبێکدا خوێندۆتەوە بەڵام ماناکەی تێناگەم بابە، دەتوانی یارمەتیم بدەی؟.)) باوکم بە تۆزێ ڕوو گرژییەوە وەڵامی دایەوە:

((بێنە بیخوێنمەوە بزانم چییە)).

کتێبەکەم کردەوەو بۆم خوێندەوە:

((قسەکردنی کەرێ... و باربردنی ئادەمیزاد شتێکی سروشتی نییە، بەڵام هەندێ ئادەمیزاد هەن ساڵەها خۆ ماندوو دەکەن تا کەر فێری قسەو دەرس خوێندن بکەن)).

باوکم بە کەمێ نارەحەتییەوە قسەکەمی بڕی:

ئەم فڵتە فڵتە لێکدانەوەی ناوێ.. ئەمە ئاشکرایە کە هەموو شتێك سروشتە ڕەسەنەکەی باشەو بەزۆری و کۆشش ناکرێ سروشت بگۆڕدرێ.

بەبێ ئەوەی هیچ دابمێنم وەڵامم دایەوە:

((ئەدی بۆچ دەتانەوێ فاتێ ڕەفتاری وەکو گەوران بێ؟))

باوکم زۆری پێناخۆش بوو بەڵام هیچیشی نەگوت و چووە ژووری نوستنێ!

زەینەب گیان پێموایە پێشبڕکەی بلیمەتەکانی ئێمەش لە ئەنجوومەنی باوکان و مامۆستایانی قوتابخانەی ئێوە کەمتر نەبووبێ. خۆ ئەگەر خۆشتر نەبووبێ بێ تامتریش نەبووە. ئەو شەوەمان زۆر خۆش ڕابوارد.

**چاوەڕێی نامەتانم**

**ئەحمەد تاربای**



## گیانەکەم..! خۆشەویستەکەم!..

ئەنقەرە 25ی مارتی 1967

ئەحمەد... نامەکەتان دوێنێ گەیشت... زۆر سوپاست دەکەم کە لەگەڵ ئەو هەموو سەرقاڵییەشتدا ئێمەت هەر لەبیر نەچۆتەوە.

دوێنێ قوتابخانە نەبوو و من لەماڵەوە مابوومەوە. لە تەنیایی و بێ ئیشیدا زۆر وەڕەز بووم. کاتێ پۆستەچییەکە نامەکەی تۆی دامێ زۆر بەخۆشی و بەو پەڕی شادییەوە چوومە ژوورەکەی خۆم و دەستم بە خوێندنەوەی کرد.. هێندە پێکەنیم چاوم پڕ بوون لە ئاو..

پێموایە ئەو داستانەی نوسیبووت ڕاست پەیوەندی بە کۆمەڵی ئێمەوەیەو لەوانەشە هەر ئەو داستانە، لە هەموو ماڵێکدا دووپات بێتەوە.

لەماڵی ئێمە پێش هەمووان بە خوشکەکەمیان دەگوت ((بلیمەت))ە! بەڵام کە دوایی ئومێدیان لەو بڕی بایاندایەوە سەر من و مەتین، زۆر سوپاس بۆ خوا کە ئێمەشیان زوو بۆ دەرکەوت کە بلیمەت نین و وازیان لێ هێنایین.

ئەو ڕۆژانەم هەر لەبیرە کە دەیانویست خوشکەکەم بلیمەت کەن.. ئەو کاتە من نەچووبوومە قوتابخانە.. کاتێ باوکم دەهاتەوە ماڵێ قەڵەم و کتێبی دەهێنا پێشێ و دەرسی فەرەنسی بە خوشکم دەگوت: دەیویست هەڵبەستێکی فەرەنسی پێ لەبەرکا.. هەڵبەستەکەم هەموو لەبیر نەماوە...

((لوبیرژێ سۆن شیەن))

((جم مون شیەن، اون بون گاردیەن))





((کی مانژیو، ترڤای بیەن))

ماناکەشی نازانم بەڵام هێندەم گوێ لێبووە هەموویم هاتۆتە بەرێ. جا بۆ ئەوەی خوشکەکەم فێری ببێ و لەبەری بکات باوکم هێندەی دووپات کردبۆوە نە هەرمن بەڵکە دایکم و کارەکەرەکەشمان کە خوێندەواریش نین وەك ئاوێیان ڕەوان بوو. بەڵام خوشکەکەم تەنانەت دێڕێکیشی لێ فێر نەبوو.. وەکو بیەوێ زمانی چینی فێر نەبێ.. خۆی خێل و خوار دەکردو وشەو دەنگی سەیرو سەمەرەی لە زاری دەردەفرتاندن ((شن تانگ، بانگ! ؟))

باوکم هەرچەند هەڕەشەی لێدەکرد.. دڵی دەدایەوە. لێیدەدا، دیاری بۆ دەکڕی سوودی نەبوو.. ڕۆژێکیان برادەرێکی باوکم کە لە زانکۆ بەناوبانگەکانی ئەورووپاو ئەمەریکا شەهادەی پەروەردەی منداڵانی وەرگرتبوو بە باوکمی گوت:

((فێربوونی هەر شتێك ئامادەییەکی تایبەتی پێویستە. ئێوە نابێ زۆر لە منداڵ بکەن بە ناچاری قسەتان وەربگرێ. کاتێ کە من لە پاریس بووم کۆمەڵێکم دیتن لەگەڵ ئەوەشدا چەند ساڵ بوو لەوێ بوون نەیاندەتوانی بە فەرەنسی بدوێن بەڵام ئامادەییەکی سەیری خۆناسینیان بە خەڵکی هەبوو، لەوانەیە کچەکەی ئێوەش لەوانە بێت!.

هەر منداڵەو ئامادەیی کارێکی تێدایە پێویستە لە پێشەوە ئەو ئامادەییە لە منداڵدا بدۆزرێتەوە ئینجا پەروەردە بکرێ.

لە دوای ئەو قسە بەڕێ و جێیانەی ئەو مامۆستایە باوکم خۆی بەدەستەوەدا. فێرکردنی زمانی فەرەنسی بەلاوە نا. هەر خەریکی چاوەدێری ئەو ئامادەییە ڕاستەقینەیەی خوشکم بوو تێیدا بدۆزێتەوە.

ئەمجارەیان مامۆستای ((مۆسیقا))ی بۆ ڕاگرت فێری کەمانی بکات بەڵام دیسانەوە ئەو ئامادەییەی خوشکم لە دەرسی کەمانیشدا وەدەرنەکەوت!. ئەو مامۆستایەی کە دەرسی بە خوشکم دەگوت گوتی:



– ماشەڵڵا ئەم منداڵە ئامادەییەکی باشی هەیە! ئەو هەموو ئازارەم لەگەڵدا کێشاوە کەچی هێشتا ( لا) لە (سی)[1] و دەنگی جیڕە جیڕی دەرگای لە دەنگی کەمان جیا ناکاتەوە!

بەڕاستی مامۆستاکە هەقی بوو! خوشکەکەم وایە، بۆ نموونە ئەگەر لە مەتبەخ پەرداغێ یا دەورییەك بەربێتەوەو بشکێ ئەو وادەزانێ لە دەرگای حەسارێ دەدەن و دەچێ دەرگا دەکاتەوە!.

کاتێ خوشکەکەم لە قوتابخانەی سەرتاییدا دەیخوێند مامۆستاکەی گوتبووی:

((کچەکە گیان کاتێ قوتابییەکان سروود دەڵێن، تۆ مەیڵێ چونکە لە هەمووانی تێك دەدەی)).

کاتێ زانیان فێربوونی مۆسیقاکەشی هیچ دەرچوو بڕیار درا فێری وێنەو نیگارکێشانی بکەن، تا هەر نەبێ ببێتە بلیمەتێکی وێنەو نیگارکێشان، کەئەویش نەبوو هاتنە سەر ((سەما)) فێرکردنی، کەچی خوشکم لە سەماکردنیشدا هیچ پێشکەوتنێکی وەدەست نەهێنا، بەڵام هەر چۆنێك بوو بۆ ئەو باش بوو، چونکە جاران نەیدەزانی بە ڕێگاشدا بڕوات، کاتێ لەناو ماڵ دەهات و دەچوو هەر ئەولاولای دەکردو وەك سەرخۆشان ڕەتەڵی دەبرد، بەڵام دوای ئەوەی مەشقی سەماکردنێی کرد هەرچاك بوو فێری ڕۆیینێ بوو!. دوای ئەو هەموو هەوڵ و تەقەڵڵاو ماندوو بوونەش دایکم و باوکم تێگەیشتن کە خوشکەکەم ئامادەیی هیچ جۆرە شتێکی نیەو ناتوانن بیکەن بە بلیمەت بەرۆکیان بەرداو گوتیان:

((وازی لێ بێنن بخوێنێ)).

(1) لا – سی: دوو پلەی سەر پەیژەی مۆسیقان کە هەریەکە دەنگێکی تایبەتی هەیە.





بەڵام خوشکەکەم هەروا بە پۆل و قوتابخانەشدا ڕیا. لە هەر پۆلێك دوو سێ ساڵ مایەوەو تا دوایی لە پۆلی سێیەمی ناوەندی ناچار بوو واز لە خوێندن بێنێ!.

دایکم کە زانی کار لە کار ترازاوە گوتی:

((وا پێدەچێ کچەکەم ئامادەیی ماڵ و ماڵداری هەبێ))

ئەم تاقیکردنەوەیەش زۆری نەخایاندو خوشکەکەم هێندەی بێ سەروبەرەیی لە کاروباری ماڵێدا پەیدا کردو هێندەی پەرداغ و قاپ و هەوڕ شکاندن تەنانەت چوونە مەتبەخیشیان لێ قەدەغەکرد!.

خۆ ئەگەر پێنج دەقیقە چووبایە مەتبەخ، دایکم دەبایە دوو سەعاتان خەریك بایەو هەر شتەی لە کون و کەلێنێك و پەناو پەسیوێکا دۆزیبایەوە.

باوکم چیدی تاوی ئەم حاڵەی نەما. دڵنیا بوو کە خوشکەکەم مێشکی لەقیوە!.

بردیانە لای پزیشکێکی دەروونی! خوا کاری پزیشکە ڕاست بێنێ کە خۆی بە دەست قسەی باوکمەوە نەداو گوتی:

((هەموو سوچی ئێوەیە.. ئێوە بۆ دۆزینەوەی ئامادەیی منداڵەکە ڕۆژێتان بەم ڕۆژە گەیاندووە!. وازی لێ بێنن، ماوەیەك بۆ خۆی چ دەکا با بیکا، بۆ خۆی چاك دەبێ)).

لەو ڕۆژە بەدواوە ئیدی خوشکەکەم ئازادو سەربەست بوو و لە جیاتی ئەو من دەداوێ کەوتم. لەسەرم پێویست کرا بێ هیچ یارمەتی و پشتگیرییەك ببمە ((بلیمەت)).

باوك و دایکم کە بۆ دۆزینەوەی ئامادەیی خوشکەکەم زۆریان ئازارو ماندوویی کێشابوو و زۆریشیان لی خەرج کردبوو دەیانویست بە من و مەتینی پڕکەنەوە. خۆ ئەگەر سێیەکی ئەو ماندوو بوونەو دراوەی لەویاندابوو لە ئێمەیان دابایە هەردووکمان پێکەوە ((بلیمەت)) دەردەچووین.



لەبەر ئەوەی مەتین زۆری سەر لە کاروباری هونەری و پیشەسازیدا دەخوری، لەماڵی ئێمەدا لە ڕادیۆوە بگرە تا ماشێنی هەوڕ شۆرین و ماشێنی ڕیش تاشینی باوکم و مەنجەڵی بوخار هەمووی لەبەریەك هێنابوونە دەرێ و لە کاری خستبوون!. زەنبەرەکی سەعاتی دیواری دەرێنابوو و لە مەنجەڵی بوخاری پێچابوو و هەڵپێچی مەکینەی دوورمانی بەڕادیۆوە شەتەك دابوو.. لەگەڵ ئەوەشدا باوکم هەر دەیگوت:

((مەتین منداڵێکی بێ هونەرو تەوەزەل و دەست و پێ سپییە!))

توخوا هونەر لەمە زیاتر!. باوکم هاوڕێی پۆلی سەردەمی خۆی ڕادەناو پێیدا هەڵدەدا:

دراوسێیەکمان کچێکیان هەیە کە ئەم بەڕاستی نائاسایی و بلیمەتە.. ((ئەو کچۆڵە وەکو گەوران لەسەر مێز دادەنیشێ و نان دەخوا!.. و وەکو گەورانیش دەدوێ)).

من لە بیستنی ئەو قسانە هێندەم رق هەستابوو حەزم دەکرد یەك چنگە تفی بە سەروچاوان داکەم... باشە شەرمێ ناکا لەلای ئێمە ئەو درۆیە گەورەی دەکا؟. ئێمە ئەو ((نورتەن))ە باش دەناسین.. هەر کاتێ دایك و باوکی لەماڵەوە دەچنە دەرێ کچەکەیان دێننە ماڵی ئێمەو بەدایکمی دەسپێرن. دایکی ئێمەش هەر کاتێ بیەوێ بچێتە دەرێ من و مەتینیش بەوان دەسپێرێ تا براکەم دەست لە رادیۆو سەللاجەوە نەدات و دیسانەوە دەستە گوڵێك لێنەداتەوە.

چەند ڕۆژێ لەمەو پێش دایکم لەماڵ چووە دەرێ و ئێمەشی ناردە ماڵی ((نورتەن)). هەموومان لە ژوورێکدا کۆببووینەوەو منیش بۆ دابینکردنی ئەوان ((مەتین و نۆرتەن)) دەستم بە خوێندنەوەی کتێبێکی چیرۆکی منداڵانە کرد.





نورتەن لە ناوەڕاستی قساندا بە فیڵی ئاو خواردنێوە لە ژووریٚ وەدەرکەوت. کاتیٚ کە هاتەوە دیتم ئەوا ((پڕمە پڕم)) پێدەکەنیٚ. پرسیم:

– نورتەن چییە؟ بۆ پێدەکەنی؟

وەڵامی دایەوە:

– دایکم و باوکم خەریکی هەران.. وەرن بچین سەیرکەین.

– چۆن دەزانی؟

چووم ئاویٚ بخۆمەوە بە بەردەمی دەرگای ژوورەکەیاندا تێپەڕیم. هەر کە دایکم منی دیت بەدەنگێکی بەرزەوە بە باوکمی گوت: ((خۆشەویستەکەم. گیانەکەم)).

باوکیشم وەڵامی دایەوە: ((چییە گیانەکەم!)).

من کە مانای ئەو قسانەم چاك دەزانی پرسیم:

– ئەمانە قسەی خۆشن. لەکویٚ هەرایە! ؟

نورتەن بە دەنگێکی بەرزەوە پێدەکەنی:

– پیەح!.. تۆ چووزانی.. بۆ ئەوەی من بەدخوو دەرنەچم و باوکم و دایکم هیچ کاتیٚ لەلای من قسەی خراپ پێك ناڵێن و هەر قسەی باش... باش دەکەن بەڵام ئەگەر منداڵ لەویٚ نەبن هەرایەکیانە مەپرسە. یاڵڵا منداڵینە ئەگەر زۆر ڕاوەستن هەرایەکە دەبڕێتەوە و ئێمەش دەستمان بە هیچ ڕاناگا.

من بەناو هێنانی (هەرا) زۆر سەغڵەت دەبم، لەجێی خۆم هەستام و گوتم:

– ئێمە دەبیٚ بڕۆین. باوکم و دایکم ئێستا دێنەوە.



کەوتینە ڕیٚ بڕۆینەوە. کە گەیشتینە بەر دەرگای داڵانەکە دیمەنێکی سەیرمان دیت. ئەگەر بمانزانیبایە تووشی ئەم جۆرە دیمەنە دەبین بە داڵانەکەدا نەدەهاتین بەڵام تازەکار لەکار ترازاوەو ڕێی گەڕانەوە نییە.

پیاڵەکان هەموو لەو ناوەدا بڵاو ببوونەوە... قژی دایکی نورتەن هەمووی ئاڵۆزکاو بوو و خوێن بەسەرو گوێلاکی باوکی نورتەندا دەهاتە خواریٚ.

باوکی نورتەن هەر کە ئێمەی دیت گوتی:

– خۆشەویستەکەم پیاڵەکان کۆکەرەوە!.

دایکیشی کە بە دیتنی ئێمە خۆی لیٚ ون ببوو وەڵامی دایەوە:

– بە چاوان خۆشەویستەکەم!

ئێمە شتەکە تێگەیشتبووین و نەمانتوانی خۆمان ڕاگرین بە دەنگێکی بەرزەوە پێکەنین.. دایکی نورتەن زۆر توڕە بوو و قیژاندی:

– کچیٚ چەند جارم گوتووە بیٚ لە دەرگادان نەیەیتە ژووریٚ!.

– دوایی بەلای مێردەکەیەوە چوو:

– خۆشەویستەکەم قاوەیەکت بۆ لێنێم؟.

باوکی نورتەن وەڵامی دایەوە:

– لێینیٚ جەرگەکەم!. باتۆزیٚ کەم شەکر بیٚ خۆشەویستەکەم!.

تاکە پێڵاوەکەی دایکی نورتەن لەناو لینگی مێردەکەیدا کەوتبوو.

باوکی نورتەن کە هێشتا سەری هەر دەناو دەستی خۆی گرتبوو گوتی:

– نازانم چۆن هەڵخلیسکام و کەوتم!.





ئێمەش دووبارە پێکەنینەوە.. بە راکردنەوە هاتینەوە ماڵ... ومن دەستم بە نوسینی ئەم نامەیە کرد بۆ تۆ!

دەنگی کۆکەی باوکم لەدەرەوەڕا دەبیسترا دیار بوو ئەویش دەیویست گیانەکەم و خۆشەویستەکەم بەدایکم بڵێ!.

ئەحمەد گیان بەخوات دەسپێرم. ئیشاڵڵا هەفتەی داهاتوو نامەیەکی درێژترت بۆ دەنووسم.

**ئاواڵت**

**زەینەب یالکەر**



## لەلای میوانان..

ئەستەمبۆڵ 30ی مارتی 1967

ئاواڵی خۆشەویستم زەینەب. دوای خوێندنەوەی نامەکەت و بەیت و بالۆرەی ئەو دراوسێیانەی کە سوورن لەسەر ئەوەی بیسەلمێنن کە منداڵی هەریەکەیان لە هەموو منداڵەکانی دی بە هۆش و گۆشتر و بلیمەتترەو ئەو هەموو ناخۆشی و هەراو بگرەو بەردەیەی کە لەمەوە پەیدا بووە، هەزار جار سوپاس بۆ خوا کە ئێمە کرێچی نین و خانووەکەشمان هەرچەندە بچکۆڵەیە بەڵام هی خۆمانە.. و ئەم جۆرە پێشهاتانەی لەلای ئێوە ڕوو دەدەن لای ئێمە کەمتر سەر هەڵدەدەن.

دیارە ئەم جۆرە ڕووداوانە بۆ هەموو کەسێك دێنە پێش و هەفتەی ڕابردوو ئێمەش شتێکی وامان هاتە ڕێ کە زۆر سەیرە!

باوکم بۆ نانخواردنی نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی بەڕێوەبەری کارخانەکەی خۆیانی بانگ کردبوو. هەر لە چوارشەممەوە دایکمی لێ ئاگادار کردبۆوە. هەموومان لەبیستنی ئەم باسە واقمان وڕما. نەك لەبەر ئەوەی کە بەڕێوەبەری کارخانەکە پیاوێکی گرنگ و پایە بەرزە بەڵکو لەبەر ئەوەی کە باوکم زۆری ڕق لێی بوو و هەمیشە بە خراپی ناوی دەهێنا. هەر کاتێ ناوی بەڕێوەبەر هاتبایە ناو قسانەوە باوکم وەك جنێوی پێ بدەن وابوو لە نارەحەتی و تووڕەییاندا ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕا!

بە دایکمم گوت: ئەم پیاوە بۆ دێتە ماڵی ئێمە؟





دایکم بە نارەحەتییەوە وەڵامی دامەوە: شێتە.. ئەوە قسەیە دەیکەی، خەڵك خواخوایەتی پیاوێکی ئەوها پایە بڵندو گەورە بێتە ماڵی، دەبێ خۆشحاڵ بین کە بەڕێوەبەری کارخانە دێتە ماڵی ئێمە!.

– باشە خۆ باوکم زۆری ڕق لێیەتی!.

– بەڵام ئەو باوکتی زۆر خۆشدەوێ.

بۆچی! ؟

– ئەدی نازانی باوکت بۆتە نوێنەری کرێکارانی کارخانە؟

من مانگێك لەمەوبەر ئەمەم دەزانی ((ئاوا، دەنا بەڕێوەبەری کارخانە ئیشی بە ماڵی ئێمە چییە؟)) چونکە تا ئەم کاتەش بەڕێوەبەرم نەدیتبوو و باوکیشم زۆری خراپە دەگوت هەر خوا خوام بوو نەیبینم. ئەوم وەك دێو و درنج و دڕندە دەهاتە بەر چاوان.

لەبەر هاتنی بەڕێوەبەر وەزعێکی نائاسایی لە ماڵی ئێمە پەیدا بوو. باوکم بۆیاغچی هێناو تەواوی دەرگاو پەنجەرەی ڕەنگ و بۆیاغ کردنەوە... دایکیشم لە کون و قوژبنی ژوورەکانەوە تا دەرکی حەسارێی وەك ئاوێنە لێکرد. گوتم:

بابە گیان خۆ تۆ زۆرت ڕق لە بەڕێوەبەرە ئەدی بۆ هێندەی پێوە ماندووی؟

باوکم لە تووڕەییاندا لە جیاتی ئەوەی فلچەی بۆیەکە بخاتە ناو قوتووەکەی خۆیەوە لە دیواری سپی هەڵسوی و وەڵامی دایەوە:

چبکەم دەمویست کوێراییم داهاتبایە و ڕووی نەکردبایەتە ئێرە.. ئیزرائیل هاتبایە نەك ئەم، بەڵام ناچارم.

دایکم چووە ماڵە دراوسێیەکان پەرداغ و دەوری و سفرەی ناخواردنی پاك و ئا لەم جۆرە شتانەی زۆر خواستنەوەو هێنانی!



بەر لە ڕۆژێك کەوتە چێشت لێنان و خوادنی هەمە چەشن و جۆراو جۆر.. باوکم لەگەڵ ئەوەی کە بەیانیان هەمیشە درەنگ لەخەو هەڵدەستا، ئەو ڕۆژە لەگەڵ گەردی بەیانی لە ژووری نووستن هاتە دەرێ.

بەسەرسامییەکەوە پرسیم:

– بۆ بابە گیان میوانەکەمان ئەوها زوو دێت؟.

باوکم مینگەیەکی کرد:

لەبەر خاتری ئەو وا زوو هەستام!.

هەرچەندە باوکم فێر نەبوو لە کاروباری ماڵەوەدا یارمەتی دایکم بدات، بەڵام ئەو ڕۆژە یەکسەر چووە مەتبەخ و قۆڵی یارمەتی لێ هەڵکرد!.. جار جارەش دەچووە بەر پەنجەرەو سەیرێکی سەر شەقامەکەی دەکرد! دەوروبەری نیوەڕۆ بوو حەجمینی نەمابوو، یا لە ژوورێی ڕاویچکە دەکردن یا لە پەنجەرەیڕا سەرێکی لە شەقامی دەرەوە خوار دەکردەوە:

((نازانم یارۆ لەکوێ گیری خواردووە! بۆ وەدرەنگ کەوت!.))

دایکم مێزی ناخواردنی ئامادەکردو چاوەڕێی هاتنی جەنابی بەڕێوەبەر بوو خواردن تێبکاو بیهێنێتە سەر مێزێ!.. لەپڕ هۆڕنی ئۆتۆمبێلێك لە شەقامەکەوە هاتە بەر گوێ.

باوکم هاواری کرد:

– ((یاڵڵا منداڵینە خێرا بڕۆن دەرگاکە بکەنەوە، پێموابێ هات.. بۆ ڕاوەستاون؟))

خۆشی لە پەنجەرەکەوە تا نیوەی خۆی شۆڕ کردبۆوەو سەیری دەرەوەی دەکرد. دایکیشم کە دەست و پێی خۆی لێ ون ببوو وەك ((با)) بەسەر

پلیكانەكاندا بەرەو دەرگا فڕی، باوكیشم بەدوای دایكمدا وا هاتە خوارێ هێندەی نەمابوو ملی بشكێ.

من لە پەنجەرەكەوە سەیری دەرەوەم دەكرد، دیتم لەبەر دەركی حەسارێ ئۆتۆمبێلێكی سوور ڕاوەستاوە، باوكم گەیبە دەركی حەسارێ و دوولا بۆوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: ((هەر دەبێ تاوداتە بەردی و بەسەری بەڕێوەبەری دادا!.)) بەڵام نەء دیار بوو ئەمە نیشانەی پێشوازی لێكردن بوو. دەتگوت بووكە شووشەی بە قوڕمیشەو كۆكیان كردووە هەر ڕاست دەبۆوەو دەچەمیەوە!. و بە زمانی لوس و دەمەلاسكێوە بەخێر هاتنی دەكردو پەیتا پەیتا دەیگوت: ((فەرموون.. بەخێر بێن.. خۆشیتان هێنا!.))

تا لە پلیكانەكان سەركەوتن و گەیشتنە هۆڵەكە باوكم هەر خەریكی ڕێزگرتن و سوپاس و پایە لێنانی ئەو سەربەرزییە بوو كە جەنابی بەڕێوەبەر بە ماڵەكەمانی بەخشیوە.

منیش چوومە دالآنەكە.. باوكم خەریكی داماڵینی پاڵتۆی بەڕێوەبەر بوو لەبەری، هەروەك فەڕڕاشەكانی بەردەركی بەڕێوەبەرە گەورەكان هەموو جووڵانەوەیەكی كلكە سووتەو نۆكەر ئاسایی بوو!. باوكم پاڵتۆی بەڕێوەبەری هەڵواسی و بەدوای ئەودا بەرەو ناو هۆڵەكەوە هاتن. من بە پێچەوانەی باوكمەوە كە جەنابی بەڕێوەبەری بە دێو و ورچ و بەراز دانابوو بە پیاوێكی شێواز زان و گەورە و لێهاتووم هاتە پێش چاو، من زیاتر سەرم لەوە سوڕمابوو كە بۆچی باوكم لە پاشملە ئەو هەموو جنێو و قسە ناشیرینانەی پێ دەگوت و ئێستاش دەتگوت نۆكەرە لەبەردەمیا وەستاوە!

دایكم هاتە هۆڵەكەو تەوقەی لەگەڵ جەنابی بەڕێوەبەردا كرد! منیش تەوقەم لەگەڵدا كرد.

باوكم گوتی: كوڕی خۆم دەستی جەنابی بەڕێوەبەر ماچ كە!.



ناچار بووم دەستیشی ماچ بكەم... دایكم مۆڵەتی خواست و چوو خواردن ئامادە بكات. باوكیشم بەرامبەر بەڕێوەبەر دانیشت و لەسەرخۆ دەستیان بە قسان كرد.. من بەبێ ئەوەی سەرێك لەم كارە دەركەم لە گۆشەیەكی ژوورەكەدا بۆ چاودێری ڕووداوی دواتر خۆم ((مات)) كرد!. پێش دوو ڕۆژ دایكم ( فاتێ)ی فێردەكرد چۆن لەلای میوانان ڕەفتار بكات. تەنها كاتێكیش ئەو ئامۆژگارییانەی دەكرد كە من لەوێ بام تا منیش گوێم لێبێ.. فاتێ تەواوی ئەو قسانەی دایكم فێری دەكرد دەیگوتنەوە و دایكیشم جار جارە بە تیلەی چاو سەیرێكی منی دەكرد داخوا گوێ دەگرم یان نا!

((كچی خۆم نەكەی لەلای میوانان نارەحەتی بكەی ها ؟!!))

((نەكا پەنجەت بخەیتەلو وتتەوە، یا زمانت دەربێنی!)) ئەگەر شتێكت لێ كەوت هەڵی نەگریەوەو بیخەیتە دەمتەوە! باشە!؟ بەتایبەتی ئەوەت لەبیر بێ هیچ كاتێ لەلای میوانان ئەگەر بانگ كرای نەڵێی ((هۆ و)).

فاتێ لە پڕ قسەكەی بە دایكم بڕی و لێی پرسی:

((باشە دایە لەلای میوانان چ بڵێم!))

- لەجیاتی ((هۆ و)) بڵێ ((بەڵێ))

دایكم دیسانەوە چاوێكی لەمن كردو لە دواییدا پرسی:

كوڕم تۆش تێگەیشتی؟. پیاو دەبێ لەلای میوانان هەموو قسەیەك بە بەڵێ دەست پێبكات و بە ( بەڵێ )ش دوایی پێبێنی!.

كە باوكم لەگەڵ جەنابی بەڕێوەبەردا خەریكی قسان بوون من تەواوی هێزی خۆمم لە گوێییەكانمدا كۆ كردبۆوە تا بزانم باوكم قسەكانی چۆن بە ( بەڵێ ) دەست پێدەكات و بە ( بەڵێ )ش دوایی پێ دێنێ.. بەڵام هەر چەند زەینم دایە شتێكی لە قسەكانیان نە دەبیست.. لەو دەمیدا دایكم هاتە ژوورێ و گوتی:

– فەرموون.. نان ئامادەیە.

جەنابی بەڕێوەبەر بە زەردەخەنەیەکی تایبەتییەوە وەڵامی دایەوە:

سوپاس خاتوون... پێویستی بەو زەحمەتە نەدەکرد.. نیوەڕۆ ناتوانم بمێنمەوە!. دایکی بێچارەم وەك داری بەبنا گوێبیدادەی بە حەپەساوییەوە بەرەو دەرکی ژووری ملی نا... دوو ڕۆژ گیانت دەرچێ و ماندوو بە ئێستا جەنابی بەڕێوەبەر دەفەرمووێ:

((نیوەڕۆ ناتوانم بمێنمەوە!))

بەڵام باوکم وازی نەهێنا هێندەی پێ داگرت تا جەنابی بەڕێوەبەری هێنایە سەر مێز، کە لەسەر مێزی نانخواردن دانیشتین باوکم پێی گوتم:

– ڕۆڵە ئاو بکەرە پەرداغەکانەوە..

من کە هێندە کەوتبوومە ژێر تاوی قسەکانی باوکم و شەخسیەتی جەنابی بەڕێوەبەرەوە خۆم لێ ون ببوو. پەرداغەکانم هێندە پڕ کردن ئاوەکە ڕژایە سەر مێزەکە!.

باوکم زۆر تووڕە بوو:

– کوڕە بەم هەموو قەڵافەتەتەوە ئاو تێکردنێك نازانی؟.

ئەمەی گوت و ویستی بەدەستەسڕ ئاوی سەرمێزکە پاك کاتەوە دەستی لە قاپی زەڵاتەکە هەڵنگوت و زەڵاتە وەرسوڕایەوەو ڕژایە کۆشی دایکمەوە.

دایکم ئەبلەق بوو و کشایەوە تا جلەکانی لەبەین نەچن، قاپێك شلە بەسەر جلەکانی بەڕێوەبەردا وەرگەڕا!.



دەتۆ وەرە توخوا کاری وا خراپ تەماشاکە... دایکی بێ دەرەتانم یەکسەر داوای لێبووردنی لە جەنابی بەڕێوەبەر کردو دەستی بەسەرزەنشتی فاتێ کردو نوقورچی لێ بادا!. فاتێ نەیتوانی خۆی ڕاگرێ و دەستیکرد بە گریان و گوتی:

– دایە تۆ خۆت کاری خراپ دەکەی بۆ لە من دەدەی؟.

باوکم کە زۆر تووڕە ببوو بەسەر دایکمیدا قیژاند:

– ئەدی پێم نەگوتووی بەجیا نان بدەرە منداڵان.

دایکم کەوتە ژێرکردنەوەی فاتێ و لەسەرخۆ پێی گوت:

– مەگری.. کەس لای میوانان دەگری؟

فاتێ هاتەوە سەرخۆی و دایکم قاپێك شلەی بردە پێشێ تا دەورییەکەی جەنابی بەڕێوەبەر پڕ کاتەوە.. کە دەیویست کەوچکی سێیەمی تێکاتەوە بەڕێوەبەر دەورییەکەی ڕاکێشایە ئەولاوە و شلە ڕژایە قاپی جەلییەوە.

دایکم لە نارەحەتیاندا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا.

((ئای... قوڕم بە سەری چم کرد؟))

چ دایکم و چ باوکم وایان سەر لێشێوا، سفرەکە هەموو تێکەڵ و پێکەڵ بوو... باوکم لەجیاتی خوێ بیبەری کردە چێشتەکەیەوە! کاتێ زانی بیبەرە گوتی: ((تەڕەماشەکە، خوێدانەکە لە کوێیە؟))

دایکم لەجیاتی خوێدان ئاڵەتدانی دایە!. بەڵام من کە لە هەمووان لەسەرخۆتر بووم خوێدانەکەم بۆ باوکم ڕاداشت... باوکم بە تووڕەییەوە خوێدانەکەی بزاوت، لەبێ بەختیان سەری خویدانەکە کرایەوەو هەرچی خوێی تێدابوو هەمووی ڕژایە ناو قاپەکەیەوە! دایکم کە هیچ ئاگایەکی لەخۆی نەما بوو ڕووی کردە جەنابی بەڕێوەبەر و گوتی:

((چۆنی قوربان؟!))

جەنابی بەڕێوەبەر کە لەو پرسیارە گێژو وێژ ببوو پێکەنینێکی هاتێ و پرسی:

– چیتان فەرموو؟

دایکم خراپی لێقەومابوو و بۆ ئەوەی شتەکە وەك خۆی لێ بێتەوە گوتی:

– نازانم خواردنەکە چۆنە؟. باشە؟. بەدڵتانە؟

جەنابی بەڕێوەبەر کە بە زۆر ددانی بەخۆیدا دەگرت و پێکەنینەکەی دەشاردەوە وەڵامی دایەوە:

دەستتان خۆشبێ... زۆر بەتام و خوێیە!.

لەو دەمەیدا پارویێك لە ئەوکی فاتێ ما، دایکم لەجێی خۆی دەرپەڕی و بە دەستێك لە پشتی فاتێی دەداو بە دەستەکەی دیشی پەرداغە ئاوی بەزاریدا دەکرد! باوکم زۆری پێ گوتبووین کە دەبێ چەقۆ بە دەستی ڕاست و چەتاڵیش بە دەستی چەپە بگرین. بەڵام من هەرچیەکم کرد نەمتوانی ئەم کارە بەم شێوەیە ئەنجام بدەم.. کاتێ چەتاڵەکەم بە دەستی چەپمەوە دەگرت نەمدەتوانی بۆ دەمی بەرمەوە! بۆیە هیچ گوێم نەدایە و چەتاڵم بە دەستی ڕاست و چەقۆ بە دەستی چەپەوە گرت. باوکم خەریکی پارچە گۆشتێکی ناو قاپەکە بوو دەیبڕی.. لەو دەمەیدا هۆشی بەلای هەڵەی منەوە بوو بە تووڕەییەکەوە چاوێکی لێ زەق کردمەوە، بەڵام هەر لەو کاتەدا پارچە ئێسقانی گۆشتەکە لەبن چەقۆکەوە دەرپەڕی و کەوتە ناو قاپی میوەکەوە!.

لە دواییدا بە هەر ناوچەوان ڕەشیەك بوو نانخواردن کۆتایی هات! و هاتینەوە هۆڵەکە.



کە دایکم قاوەی هێنا، جەنابی بەڕێوەبەر دەیویست بە ڕوویەکی خۆش و گەشەوە دڵتەنگییەکەی هەمووان بڕەوێنێتەوە... ڕووی لەمن کردو بەزەردەخەنەیەکەوە پرسی:

– کوڕی باش پۆلی چەندی؟

– بەڵێ! پۆلی پێنجم قوربان... بەڵێ!.

بۆ ئەوەی بزانم وشەی (بەڵێ)یەکەم باش و لە جێگای خۆیدا گوتووە یان نا.. تەماشایەکی دەموچاوی دایکم و باوکم کرد. هەردووکیان پێدەکەنین، زانیم بە دڵیانە.

جەنابی بەڕێوەبەر دووبارە پرسی:

– تەمەنت چەندە؟.

– بەڵێ!. یازدە ساڵ... بەڵێ!.

کە گەورە بوویت پێت خۆشە ببیە چی؟.

– بەڵێ!. نووسەر. بەڵێ.

– هەربژیت.

دووبارە لە ژێرەوە سەیرێکی دایکمم کردەوە خەریك بوو لەپەدەستی لێکدەدان و شتێکی دەگوت، وای تێگەیشتم دەڵێ سوپاسی بەڕێوەبەر بکە. منیش بەبێ هیچ پێشەکییەك بێدەنگیم شڵەقاندو گوتم:

– بەڵێ!. قوربان سوپاست دەکەم! بەڵێ!.

جەنابی بەڕێوەبەر هیچ لەو سوپاسە درەنگ وەختە تێنەگەیشت یەکڕاست دەستی بە پێکەنین کرد. دایکم بۆ ئەوەی ئەمە پینە بکات قاپی میوەکەی هەڵگرت و لەبەردەم جەنابی بەڕێوەبەری ڕاگرت. دواییش بۆ باوکم و دوای

هەمووانیش نۆرەی من و فاتیٚ هات، فاتیٚ بۆ کۆتایی هێنانی دانیشتنەکە زیاتری گوو لە ئیشەکە کردو بووە قارەمانی منداڵە بلیمەتەکان. کاتیٚ دایکم قاپی میوەکەی بۆ ڕاگرت فاتیٚ ویستی مۆزێك هەڵگریٚ. بۆ نەگبەتی مۆزەکەی لەدەست بەربۆوە سەر عەردی، و چونکە دایکیشم گوتبووی نابیٚ شتی کەوتوو هەڵگرێتەوەو لای میوان بخوریٚ، فاتیٚ لەکاتێکدا کە دادەهاتەوە مۆزەکە هەڵگرێتەوە بە دەنگێکی بەرز گوتی:

((شتێك لای میوان بەربێتەوە سەر عەردی نایخۆن)) مۆزەکەی لەسەر مێزەکە دانایەوەو دووبارە گوتییەوە: ((دوای ئەوەی میوان دەڕوا ئینجا دەیخۆن)) باوکم بۆ ئەوەی قسەکەی فاتیٚ سەنگەو بەرد نیٚ چەند نەرمە کۆکەیەکی کرد.

فاتیٚ گوتی:

بابە گیان کەس لەلای میوانان ناکۆکیٚ و ناپشمیٚ یا دەست لە لووتی نانیٚ!

باوکم کە زانی تا دیٚ گووی تێدەبیٚ بە پێکەنینەوە گوتی:

– هۆی فاتیٚ ئەوە چت گوت؟.

فاتیٚ زۆر بە ڕاشکاوییەوە وەڵامی دایەوە:

– ئێمە هیچی خراپمان نەگوتووە. هەر ئەو قسانەمان دووپات کردوونەوە کە فێرتان کردووین. بەڵام دایکان و باوکان مەگەر پیٚ لە هەڵەی خۆیان دەنێن لەوەو دوا دایکم و باوکم دوو سیٚ ڕۆژانمان لیٚ لالووت بوون.

زەینەب گیان ئەم هەفتەیە زۆرم درێژدادڕی کرد، ئیشاڵڵا سەرت نایەشیٚ. ئەم وێنەیەی کە لەگەڵ قوتابییەکانی پۆلدا گرتوومانە بۆتی دەنێرم تۆش ئەگەر وێنەی تازەت هەیە بۆم بنێرە.

**ئەحمەد تاربای**



## قۆپییەکردن شتێکی چەند خراپە!

ئەنقەرە 6ی نیسانی 1967

ئاواڵی خۆشەویستم ئەحمەد، بەو وێنەیەی کە ناردبووت زۆر دڵخۆش بووم، هەموو کۆنە برادەرەکانی تێدایە.. پێموایە ئەوەی لای تۆوە ڕاوەستاوە ((مینا))یە؟ وانییە؟ بەڵام باش دیار نییە، سەری حوسێنیش بەردەمی تورانی گرتووە!. یاشار دەڵێی چۆتە سەر کۆڵی جەنگیز؟.

ئاواڵی خۆشەویستم نازانی بە دیتنی ئەم وێنەیە چەند دلشاد بووم. ئەریٚ بەڕاست ( ئەمیر )ی بۆ تێدانییە!. ناکا خوانەخواستە نەخۆش بێت!. مامۆستا تازەکەتان زۆر پیرو ئوفتادە دەرچووە!.

منیش ئەم وێنەیەت بۆ دەنێرم کە لەگەڵ براکەمدا گرتوومانە. چەند ڕۆژیٚ لەمەو پێش کوڕی دراوسێیەکەمان بە کامێرای خۆی گرتی.

خۆزگە دەزانی ئەم هەفتەیە چ بەڵایەکم بەسەرهات و چۆن بەبیٚ ئەوەی ئاگام لە هیچ بێت ناوم بە قۆپییەچی دەرچوو. بەڵام بەینی خۆشمان بیٚ ئەم نازناوەشم هەروا لە خۆڕا بەسەردا نەسەپێنرا. مامۆستاکەمان لە هەموو شتێك زیاتر دوژمنی قۆپییە کردنێیە.

لە هەموو دەرسێکدا ماوەیەك دەربارەی زیانی قۆپییە قسەی بۆ دەکردین دەیگوت:

((قۆپییە دەست درێژکردنە سەر مافی قوتابییە زیرەکەکانە)). ((قۆپییەکردن جۆرە دزییەکە))





((ئەوەی قۆپییە دەکات خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ و بە دەستی خۆی فێڵ لە خۆی دەکات!)) باوکیشم هەر لەو باوەڕەدایە. هەر کاتێ باوکم و ئاواڵەکانی پێکەوە دادەنیشن هەموو هەر دەربارەی بیرەوەرییەکانی سەردەمی قوتابخانەیان دەدوێن. شەوێك باپیرم و هەموو ئاواڵەکانی باوکم لە ماڵی ئێمە بوون و سەر لەنوێ قسە بۆ لای بیرەوەرییەکانی سەردەمی قوتابخانە ڕێچکەی بەستەوە. باوکی ( نورتەن ) گوتی:

– ئەرێ بەڕاست لەبیرتانە ( سەبرییە کەچەڵ ) چ شاکارێکی کرد؟

یەکێ لە ئاواڵەکانی باوکم پرسی:

– جا خۆ ئەو شاکاری زۆر بوون، مەبەستت کامەیانە؟

– ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانیان بە دەرزی سنجاق بە پشتی چاکەتەکەیەوە لکاندبوو!. یەکپارچە هەموو ئاواڵەکانی باوکم لە قاقای پێکەنینیان دا. ژنەکان کە ئاگایان لە مەحمودی بێ زەواد نەبوو، نە دەیانتوانی لەگەڵ خەڵکەکەدا پێبکەنن، نە دڵیشیان بڕوای دەدا هەر ئەوها وەکو کەر و لاڵان ورتەیان لێوە نەیەت!

دایکی نورتەن گوتی:

دە ئێمەش تێبگەیەنن. با پێبکەنین!.

باوکی نورتەن تفێکی قووت دایەوەو دەستی پێکرد:

– سەبرییە کەچەڵ – یادی بەخێر – لە پۆلی یەکەمی ناوەندی مامۆستای بیرکاریمان بوو. لەبەر ئەوەی هەمیشە زۆر وریای قوتابییەکان بوو نەیدەهێشت بچوکترین قۆپییە بکەن، زۆری بەخۆ دەنازی و دەیگوت: ((بزانم ئەوەی پیاوە قۆپییە بکات!)).



بە ڕاستیش منداڵەکان لێی دەترسان. کاتێ پرسیارەکانی تاقیکردنەوەی دەخوێندەوە دوو چاوی هەبوون دووی دیکەشی قەرز دەکردو چوار چاوانە چاودێری دەکردین تا بەملاولادا نەڕوانین. هەمیشە وەك کوللە لەو سوچەوە بۆ ئەو سوچ هەڵدەبەزییەوەو چاودێری تەواوی ژوورەکەی دەکرد. ڕۆژێك ئاوەڵێکمان شتێکی بەسەر هێنا هەر مەپرسە.

باوکم قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

– پێموایە ( نەجدەت سیگاری ) بوو؟

– بەڵێ. جەنابی ئێستا باڵیۆزە!.

ئاوەڵێکی دیکەی باوکم گوتی:

– ئەو زیرەکی و فێڵ و ساتانەی ئەو بەکاری دەهێنان دیاربوو ڕۆژێك دەیگەننە پایەیەکی بەرز!.

بەم قسەیە هەموو قاقا پێکەنین و باوکی نورتەن درێژەی دایەوە:

– بەڵێ... نەجدەت لەگەڵ قۆپییەکانیشیدا قوتابییەکی وریاو زیرەکیش بوو، زووی پرسیارەکان وەڵام دایەوە، و وەڵامەکانیشی لەسەر پەڕەیەك نوسینەوەو بە هێواشی بە دەرزییە سنجاقێك لە پشتەوە بە چاکەتەکەی مامۆستایەوە هەڵواسی. چونکە سەبرییە کەچەڵ بەردەوام هەر دەهات و دەچوو و ئەملاولای بوو، قوتابییەکان بۆیان نەدەکرا وەڵامی پرسیارەکانی لەبەر بنووسنەوە. یەکێ لە قوتابییەکان مامۆستای بەقسانەوە دەگرت تا ئەوانیدی ئیشی خۆیان بکەن. بەرێکەوت ئەو ڕۆژە من نەمتوانی تەنانەت یەك پیتیش بنووسمەوە. کات خەریك بوو تەواو دەبوو مامۆستا بەلای مندا هەر نەدەهات. چونکە منداڵەکان نەیان دەهێشت بێ لە پڕ بیرێکی کاریگەرم بەمێشك داهات. چەند کۆکەیەکی بەرزم بۆ کرد،هەر کە سەبرییە کەچەڵ لای لێکردمەوە وام پێشاندا خەریکی قۆپییەم و بە دیتنی ئەو وا شلۆێ بووم.





بەرێکەوت فێڵەکەم گرتی و مامۆستا هات. لەبەر دەمی مێزەکەی مندا ڕاوەستاو پشتی تێکردم و لە ژێریشەوە چاودێری دەکردم تا هەر کە قۆپییەم کرد مەچەکم بگرێ.

بەم شێوەیە بێ ئەوەی قۆپییەی دی بکەم! توانیم هەموو وەڵامەکانی بنووسمەوە. ئەوەی لێشی دەبۆوە دەچووە دەرێ کاتێ زەنگی دەرەوەی لێدا تەنیا سێ کەس لەپۆلەکەدا مابووینەوە، کەهێشتا تەواومان نەکردبوو. سەبرییە کەچەڵ بە زۆر پەڕەکانی لێ ئەستاندین، چونکە زۆریش ماندوو بوو بووین لەبیرمان چۆوە پەڕەی قۆپییەکە کە بە پشتییەوە هەڵواسرابوو، لێبکەینەوە.

مامۆستا پەڕەی تاقیکردنەوەکانی کۆکردەوەو ڕاست چووە ژووری مامۆستایان..کە چۆوە ژوورێ، مامۆستایەکان پێیان زانی و هێندەیان گاڵتە پێکرد بوو هەفتەیەك هەر نەهاتە قوتابخانە.

قوتابییەکان وەك لە سەر ئاو و ئاگر بن. چاوەڕێی سزای مامۆستا بوون و ڕۆژ ژمێریان دەکرد، بەڵام باش بوو هیچ نەبوو سەبرییە کەچەڵ هەمووی بەخشین ئەگەر چی تاقیکرنەوەکەی حیساب نەکرد.

هاپۆلێکی تری باوکم گوتی:

– ئەدی ئەوەی بەسەر عەلی قەسابمان هێنا لە بیرت چۆتەوە!.

ئەو عەلی قەسابەی باسیان دەکرد مامۆستای مێژوویان دەبێ..ئەم مامۆستایە لەکاتی تاقیکردنەوەدا دەچێت لەسەر مێزێك دادەنیشێت و چاوەکانی وەك پرۆژێکتەر لە قوتابییەکان دەکا!. لە کاتی تاقیکردنەوەدا ئەوانەی پێشەوە هیچیان ناتوانن قۆپییە بکەن، بەڵام ئەوانەی دواوە بە ئارەزووی خۆیان خەریکی جلیت بازییە دەبن.

هۆیەکەشی ئەوە دەبێ مامۆستا نزیك بین دەبێ و لە دوورەوە چاوی باش نابینێ باوکم کە لەقسان بەجێمابوو، قسەی بە هەمووان بڕی:



– ئەرێ ئاواڵان بەڕاست بیرتانە لە دەرسی حافیز سەفەریدا چ کەڵەکبازییەکمان دەکرد!؟ هەموو ئاواڵەکانی باوکم قاقا پێکەنین!. و هەر یەکەیان دەستیکرد بە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەیەکی دیکەی سەردەمی قوتابخانە.

ئەو حافیز سەفەرییە مامۆستای کیمیایان بووە. لە نمرە دانان زۆر چڕ دەبێ، کاتێ دەیەوێ نمرە بۆ قوتابییەکان دابنێ، وەك لە شەرەف و ناموسی کەم بکرێتەوە ئەوها ڕەفتار دەکا.

لە یەکێ لە تاقیکردنەوەکانی ئەودا، باوکی نورتەن دە دوازدە مێشی گەورە دەگرێ و دەیخاتە قاوغە شخارتەیەکی بەتاڵەوە. کاتێ تاقیکردنەوە دەست پێدەکات وەڵامی پرسیارەکان لەسەر پەڕەی زۆر تەنك دەنوسێتەوەو، بە دەزوولەیەکی باریك بە قاچی مێشەکانیەوە دەبەستێ و بەرەڵڵای دەکات، مێشەکان لەبەر بار قورسی ناتوانن زۆر بەرز ببنەوە، تۆزێك دەفڕن و بەردەبنەوە!.

بەم جۆرە هەر قوتابییەك مێشێکی بگاتێ وەڵامی پرسیارەکانی دەنوسێتەوەو مێشەکە بەرەڵڵا دەکاتەوە تا ئەوانیدی سودی لێوەرگرن!. بۆچارە ڕەشییە لەو دەمەیدا بەڕێوەبەر دێتە ژوورەوە. یەکسەر مێشێکیان دەچێ بەسەر سەری بەڕێوەبەرەوە دەنیشێتەوە! بەم جۆرە ئیشەکە قوڕ دەبێ. بە یادی ئەو بیرەوەرییە هەموو ئاواڵەکانی باوکم ماوەیەك قاقا پێکەنین... مەتین کە زۆر کەوتبووە ژێر تین و تاوی قسەکانیانەوە پرسی:

– بابە گیان بەڕێوەبەر چی لێکردن؟

– لەگەڵ ئەمەشدا کە هەموو قوتابییەکان یەك دڵ و یەك قسە بوون و کەس متتەقی نەکرد بەڵام بەڕێوەبەر خاوەنی مێشەکانی هەر ناسی و دەیویست لە قوتابخانەی دەرکا. هەموومان زۆری لێ پاڕاینەوە تا ڕزگارمان کرد.





یەکێ لە ئاواڵەکانی باوکم گوتی:

– ئەو ئاواڵەمان ئێستا پرۆفیسۆرەو کەس بەهاوشانی خۆی نازانێ!

یەکێ لە میوانەکان لە باپیرمی پرسی:

ئێوەش کە لە قوتابخانە بوون قۆپیەتان دەکرد؟

باپیرە وەڵامی دایەوە:

– کام قوتابی لە سەردەمی قوتابخانەدا قۆپیەی نەکردووە؟! دەستی بە گێڕانەوەی یەکێ لە بیرەوەرییەکانی خۆی کرد:

– تاقیکردنەوەی دەمی بوو سێ سێ قوتابییەکان دەچوونە ژوورەوە. کاتێ نۆرەی من هات لەگەڵ دوو ئاواڵی دیکەمدا چوومە ژوورێ...

مامۆستا ناوی ئاواڵێکیانی خوێندەوە. بۆ نەگبەتی ئەمە تەمبەڵترین قوتابی پۆل بوو، هەرچییەکی لێدەپرسی وەڵامی نەدەدایەوە وەکو پەیکەر ڕاوەستابوو و تەماشای مامۆستای دەکرد... مامۆستا تووڕە بوو و گوتی: ((کوڕە هەر هیچ نازانی؟!)). لە دواییدا هەر بۆ ئەوەی نمرەیەکی بداتێ پەرداغە ئاوەکەی سەر مێزەکەی پیشانداو پرسی:

((ئەمە چی تێدایە؟)) خۆ دەنگ لە دیوارەوە هات لەوەوە نەهات! دەتگوت لاڵە. لەپشتەوە قوتابییەك دەیگوت: ((ئاو)).. کە ئەم وشەیە لە تورکیدا دوو مانای هەیە: یەکێکیان یانی ((ئەسپ)) ئەویدیان یانی ((شتێك باوێ)).

ئەمجارەیان کە مامۆستا پرسیارەکەی دووبارە کردەوە لە وەڵامەکەیدا گوتی:

((پەرداغەکە ئەسپی تێدایە!))



ئەو شەوە تا درەنگانێك دەمەتەقەی میوانەکان هەر لە دەوری ئەم باسانە دەخولانەوە!.

من لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو قسانەم زۆر پێخۆش بوو و زۆریش پێکەنیبووم، بەڵام تووشی سەغڵەتی و دوو دڵیش بوو بووم.

بەیانی کە چوومەوە قوتابخانە مامۆستاکەمان لەگەڵ قوتابییەکاندا خەریکی یاری ڤالیبۆڵ بوو... کە لێبۆوە لەناو چیمەنەکە دانیشت. بە هەلمزانی و لێم پرسی:

– مامۆستا جەنابیشت لە سەردەمی قوتابییەتیدا قۆپیەت کردووە؟

هەروەك لەسەربانێکی بەردەیەوە ئاوا شێوا، ئینجا وەڵامی دایەوە:

((بەڵی!.. کردوومە!.)) هەڵۆێستەیەکی کردو ئینجا دەستی پێکردەوە:

– بەڵام هەر من بەتەنیا نەبووم هەموو قوتابییەکان قۆپیەیان دەکرد!.

قوتابییەکی زۆر زیرەکمان هەبوو هەر مامۆستا پرسیارەکانی تەواو دەکرد ئەو وەڵامی دەدایەوەو پەڕەکەی دەدا بە مامۆستاو دەچووە دەرێ.. ئەو ڕۆژە تاقیکردنەوەی جەبرمان هەبوو پرسیارەکان زۆر قورس بوون هەموو قوتابییەکان وەك کەری لە قوڕ چەقیو چەقیبوون... ئاواڵە زیرەکەکەمان وەکو هەموو جارەکانی دی زوو وەڵامی دایەوەو پەڕەکەی دایە مامۆستا و چووە دەرێ. هەموو بەدڵشکاوییەوە تا لە دەرێ وەدەرکەوت چاویان بە دوایەوە بوو. هەموو قوتابییەکان خۆزگەی ئەوەیان بوو لەجێی ئەو بان. ئاواڵەکەمان لە دەرەوە وەڵامی پرسیارەکانی لەسەر کارتۆنێك نوسیبووەو بەسەری دارێکی درێژەوەی کردو لەبەر پەنجەرەی پۆلەکەی ڕاگرت و قوتابییەکانیش بۆ ئەوەی هەڵیان لە دەست نەچێ وەك بروسکە خێرا خێرا پەڕەکانیان لەبەر پڕ کردەوە. بەیانی ئەو ڕۆژە ئێمەش تاقیکردنەوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکانمان هەبوو، تورکان لە





تەنیشت منەوە دانیشتبوو. خۆ دەزانی تورکان کێیە. ئەوەی هەر کە مامۆستا لێی دەپرسی دەیگوت: ((لەگەڵ منتە؟.))

من ئەم دەرسەم زۆر لا خۆشە و کتێبەکەم چەند جارێك خویندبۆوەو وا ڕێکەوت پرسیارەکانیش ئاسان بوون، و ئەمانە بوون:

((دەبێ چ بکەین تا منداڵ نەخۆش نەکەوێ؟)) پرسیاری دووەم.. ((کەرەستەی یاری کردن سوودی چییە بۆ منداڵان و چۆنی سوود لێ وەردەگیرێ)).. پرسیاری سێیەم.. ((لێدانی منداڵ پێویستە یان نا؟)).

من تەنانەت دەمزانی ئەو پرسیارانە لە کام لاپەڕەی کتێبەکەش دان، هەر خێرا دەستم بە وەڵامدانەوە کرد. (تورکان) دەستی بە پاڕانەوە کرد کە پێی بڵێمەوە، من شارەزای ئەم ئیشانە نەبووم و هەر لە دەستیشم نەدەهات! بەڵام تورکان هێندە پاڕایەوە ولالایەوە ناچار بە ترس و لەرزەوە پێمگوت: ((لاپەڕە 51 و 52 بکەرەوەو بینووسەوە)).

تورکان کتێبەکەی کردەوەو، خێرا خێرا وەڵامەکانی نوسینەوەو لە پێش منیشدا پەرەکەی دایە مامۆستاو چووە دەرێ.. من ماوەیەك دوای ئەو چوومە دەرێ. لە دەرەوە تورکان هاتەلامەوەو زۆر سوپاسی کردم.. ئەو ڕۆژە بەسەرچوو بۆ بەیانی کە مامۆستا پەڕەکانی بۆ هێنواینەوەو لەبەر دەمی پۆلەکەدا نمرەکانی دەخوێندنەوە گوتی: ((منداڵینە ئێستا دەمەوێ وەڵامی ئاواڵێکتان بۆ بخوێنمەوە.. باش گوێ بگرن)).

هەموو بێدەنگ بووین و مامۆستا دەستیپێکرد: پرسیاری یەکەم ((دەبێ چ بکەین بۆ ئەوەی منداڵ نەخۆش نەکەوێ؟)) ئەمەش وەڵامەکەیە، گوێ بگرن زۆر خۆشە!..

((پێویستە بە ڕێکوپێکی پاکی بکەینەوە! تۆزەکەی لێ بتەکێنین و ماوەیەك بیکەین بە دارداو هەڵیواسین و هەڵیخەین.. کاتێ سەرما بەسەرچوو بیخەینە



ناو بوخچەوەو دەرمانی مۆریانی پێوەکەین!. بۆ ئەوەی زۆر چرچ و لۆچیش نەبێ و نەگەچڵێ نابێ بیشی شۆین!)).

قاقای پێکەنینی منداڵەکان لە پۆڵەکەدا دەنگی دایەوە... هێندێکیان هێندە پێکەنیبوون چاویان پڕ ببوو لە ئاو.

مامۆستا گوتی:

– منداڵینە تۆزێك بێدەنگ بن با پرسیاری دووەمیش بخوێنمەوە تا بزانن ئەمە چەند خۆشە!. تورکان کە لە سەغڵەتی و شەرمەزاریدا سوور هەڵگەڕابوو و گریانی لە ئەوکی مابوو نەیهێشت مامۆستا خوێندنەوەکەی تەواوکات لەجێی خۆی ڕاستبۆوەو گوتی:

– مامۆستا من ئەوانەم هەموو لەبەر کتێبەکە نوسیونەتەوە.

مامۆستا بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

– خۆم زانیم قۆپیەت کردووە. بەڵام لە جیاتی بەشی ((پاراستنی منداڵ)) بەشی ((جل و بەرگ هەڵگرتنت)) نوسیوە.

تورکان کە لە شەرمان ددانی لە چیرەوە دەبردن و مستی بۆ من ڕادەداشت گوتی:

– مامۆستا زەینەب وای پێگوتم!.

مامۆستا سەیرێکی منی کرد و سەری ڕاوەشاند:

– ئاوا. قۆپیەش دەکەی و ئەویش بە پێچەوانەوە؟!.

ڕێی دەرباز بوون نەبوو گوتم:

– مامۆستا من بە هەڵەم نەگوتووە... تەنیا گوتوومە وەڵامی پرسیارەکان لەکام لاپەڕەن. کاتێ مامۆستا کتێبەکەی تورکانی هەڵگرت و

تەماشای کرد ئاشکرابوو هەڵەکە لە کوێوە پەیدا بووە! کتێبەکەی ئەو هەر لە بنەڕەتدا لاپەڕەی 51 و 52 ی تێدا نییەو لە لاپەڕە (48)ەوە یەکسەر دەچێتە لاپەڕە (64)... و تومەز تورکانی بەستەزمان سەری لێ تێکچووە و بێ ئەوەی ئاگای لە لاپەڕەکان و پرسیارەکان بێ هەرچی لە کتێبەکەیدا وەبەر چاوان هاتووە کوێرانە نوسیویەتەوە!

مامۆستا ناردی بە دوای دایکمدا و هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەو شەوە دایکم و باوکم زۆریان بەسەردا بۆڵاندم!.

باوکم گوتی:

کچێ خۆمن ئەم ئیشەم زۆر پێ ناخۆشە کە کردووتە!

خوا ڕەحمی کرد ئەو شەوە باپیرم لە ماڵی ئێمە بوو بە باوکم و دایکمی گوت:

– وازی لێ بێنن مەگەر کچۆڵەکە چی کردووە؟ خۆ خۆی قۆپییەی نەکردووە بە هی دیکەی گوتۆتەوە!

باوکم گوتی:

– هیچ جیاوازییەکی نییە.. هەردووکیان یەك کردارن.

دایکم کەوتە پشتگیریم:

– دە باشە ئیدی، بیبڕنەوە. کامتان قۆپییەتان نەکردووە؟.

مەتین وەڵامی دایەوە:

– بەڵام خراپییەکەی ئەوەیە کە ئەوانیان نەگرتووە؟.



لەم قسەیەی مەتین زۆر تووڕە بووم، ئەگەر باوکم و دایکم لە ژوورەوە نەبانایە، مووم بەسەریەوە نەدەهێشت!

ئێستا وا مەسەلەکە خەوێنراوە. تا هەفتەی داهاتوو بزانم کار بەچی دەگات.

بە تاسەوە چاوەڕێی وەڵامی نامەتم. نامەی درێژم بۆ بنووسە.

**سەرکەوتنت دەخوازم**

**زەینەب یالکەر**

# مریشکی دراوسێ هێلکەی قاز دەکات!...

ئەستەمبۆڵ 22ی نیسانی 1967

خوشکم زەینەب نامەکەی ڕۆژی 6ی نیسان ناردبووت گەیشت. بە بینینی ئەو وێنەیەی ناردبووشت زۆر خۆشحاڵ بووم بەڵام ئەو پێشهاتەی بە سەرت هاتبوو زۆری غەمبارکردم... هاوبەشی ئەو ناخۆشیانەتم تۆ ویستووتە یارمەتی ئاواڵەکەت بدەیت کەچی بە گوناهبار دەرچوویت ویستووتە چاکە بکەیت، بەڵام لێت وە خراپە گەڕاوە زۆریشم قین لە ئاواڵەکەت هەستا و، لەهەمان کاتیشدا دڵم پێی سووتا، خۆ حوسێنەکەی ئێمە دەناسی؟... ئەویش هەروەك ئاوەڵەکەی تۆیە... ئەویش هەڵەیەکی کرد تەواوی قوتابییەکانی پۆلی هێنایە پێکەنین! بەڵام حوسێن کەسی لە تاوانەکەی خۆیەوە نەگلاند. خۆ حوسێن چاك دەناسی؟. ئاواڵێکی باشە. لە نامەکانی پێشوومدا نموونەی فیداکارییەکانیم بۆ نوسیبوویت کە لەسەر درەختەکەوە پاڵیان پێوە نابوو و بەریاندابۆوەو کەوتبووە خوارێ.. لەبیرتە؟ چەندی مامۆستای چاودێرو بەڕێوەبەر لەسەرانیان گرت کە کێ ئەوەی کردووە، کەسی تێوەرنەدا، ئەو دەمەی کە لە ئەستەمبۆڵ بوویت چوو بوویتە ماڵی حوسێنی؟ خۆ ئەگەر نەش چووبی دەزانی کە ماڵێکی هەژارن.. من جار جارە دەچمە ئەوێ. ماڵەکەیان زۆر بچکۆڵەیەو بریتییە لە تەنیا دوو هۆدەی قوڕ و حەوت سەر خێزان لەو دوو هۆدانەدا دەژین.

چونکە حوسێن زۆر ئاشنای منە هەرچی نهێنییەکی هەبێت بە منی دەڵێ و هەمیشە چی لە دڵدایە بۆ منی هەڵدەڕێژێ. هەندێ ڕۆژ کە بە چاوی فرمێسکاوییەوە دێتە قوتابخانە بێ ئەوەی قسە بکا تێدەگەم کە لە ماڵێ



گریاوە. ئەو منداڵێکی مرچ و مۆن نییە، بەڵام ئەو ناخۆشییانەی کە هەمیشە بەسەری دێن وای لێدەکەن غەمبارو کزۆڵە دیار بێ.

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر هەستمکرد کە لەبەر گریانێ زۆر هەردوو چاوی ئاوساون! بەڵام هیچیشی نەدەگوت.. و تەنانەت یەك وشەشی لەم بارەیەوە نەدرکاند... چوو لەسەر مێزەکەی خۆی دانیشت.. ئەو ڕۆژەش وانەی ڕێزمانمان هەبوو مامۆستا باسی ( ناو )ی بۆ دەکردین. دوای ئەوەی بارو شوێنی ناوی بۆ باسکردین لاپەرەیەکی کتێبەکەی کردەوەو بە ئەمیری گوت بخوێنێتەوە، پارچە نوسینەکەی ئەو پەڕەیەش ((ماڵی پەنجەرە زێڕین)) بوو.. دەبێ تۆش ئەمەت خوێندبێتەوە.

((چەند خیزانێك لە ناو دارستانێکدا لە کۆخی بچووك بچووکدا دەژیان.. یەکێ لەو خێزانانە کچێکیان هەبوو.. تۆزێك دوورتر لە کۆخەکەی ئەوان کۆشکێکی بەرز دیار بوو.. کاتێ خۆرئاوا دەبوو پەنجەرەی ئەو کۆشکە وەکو زێڕ دەبریسکایەوە، کچی ئەو ماڵە هەژارە بە بریسکانەوەی پەرنجەرەی ئەو خانووە زۆر سەرسام دەبوو و واقی وڕدەماو هەستی کرد شتێکی تێدا دەجوڵا دەیویست بزانێ هۆی بریسکانەوەی پەنجەرەی ئەو خانووە گەورەیە چییە.. تا ڕۆژێك بڕیاریدا بچێت و لە نزیکەوە لەمە بگا. بە تاقی تەنیا ڕووەو ئەو کۆشکە ملی ڕێ دەگرێت.. بەڵام کاتێ کە دەگاتە ئەوێ خۆر ئاوا دەبێ و تاریکی هەموو شوێنێك دادەپۆشێ.. بە ناچاری هەر لەوێ دەمێنێتەوەو دەنوێ تا بەیانی زوو پەردە لەسەر ئەم نهێنییە هەڵماڵێ. کە بەیانی لەگەڵ خۆرهەڵاتدا لەخەو ڕادەبێ دەبینێ هیچ سوسەیەکی درەوشانەوەو بریسکانەوەی پەنجەرەکان نییە، بەڵام پەنجەرەی کووخەکەی خۆیان لەو دوورەوە دیارە دەبریسکێتەوە ئەو کاتە تێدەگا کە ئەمە تیشکی خۆرە لە شوشەی پەنجەرەکان دەدات و دەیاندرەوشێنێتەوە)) دوای ئەوەی ئەمیر هەمووی خوێندەوە مامۆستا لێی پرسی:





- لەم پارچە نوسینەوە چ تێدەگەی؟

ئەمیر نەیتوانی وەڵامێك بداتەوە... قوتابییەکانیش هەریەکەو وەڵامێکیان دایەوە.

مامۆستاکەمان کەمێ سەغڵەت بوو و گوتی:

- شت لەمە ئاسانتر نابێت. زۆر سادەو ئاشکرایە. مەبەستی ئەم داستانە ئەوەیە، بەلای هەر یەکێك لە ئێمەوە وایە ((کە مریشکی دراوسێ هێلکەی قاز دەکات!)) ئێمە تەنیا بریسکەی پەنجەرە دراوسێیەکانمان دەبینین لە کاتێکیشدا کە پەنجەرەی ماڵەکانی خۆشمان هەر وان.. مەبەستی نووسەر لەم داستانە ئەوەیە کە مرۆڤ دەبێ بەو وەزعەی کە هەیەتی و تێیدایە ڕازی بێت دەنا وەکو ئەو کچە کاتێ کە لە خۆشی و هێمنی و دڵنیایی خۆی دوور کەوێتەوە هەست دەکا خۆشی ئەو شتەی هەر هەیە کە بۆی دەگەڕێ... کورتی مەبەستیش ئەوەیە کە ( باشترین ماڵ ماڵەکەی خۆمانە ).. لەبەر ئەوەی وشەی ( ماڵ ) لە گۆڕێدا بوو مامۆستا لە حوسێنی پرسی:

- ئادەی حوسێن تۆ پێمان بڵێ داخوا ((ماڵ)) چ حاڵەتێکی ناوە؟

حوسێن کە بەلەش لە پۆل بوو بەڵام بە گیان لە دەریای ئازارە بێ دەرمانەکانی خۆیدا پەلەقاژەی بوو، هەر ئاگاشی لە قسەکانی مامۆستا نەبوو. بە بیستنی ناوی خۆی داچڵەکی. هەستایە سەر پێ. لۆژە لۆژ هاتە بەردەمی مامۆستا.. بێدەنگ ڕاوەستا.. مامۆستا پرسیارەکەی دووپات کردەوە:

پرسیم (ماڵ) لە چ حاڵەتێکدایە؟

حوسێن وایزانی مامۆستا حاڵی (ماڵ)ی ئەوان دەپرسێ زۆر هێدی وەڵامی دایەوە:

- زۆر شڵۆقە! حاڵمان باش نییە!

مامۆستا واقی وڕمابوو گوتی:



کوڕە ئەوە هۆشت لە کوێیە؟ ئەوە بۆ وەڵامی بێ سەرو شوێن دەدەیتەوە! پرسیم ((ماڵ)) لە چ حاڵێکدایە؟.

حوسێن کە ئێستاش هەر لە جیهانەکانی خۆیدابوو... و چونکە نەشیدەویست لەبەردەمی ئاواڵەکانی پۆلەکەیدا نهێنی خێزانەکەیان ئاشکرا بکات بە نوزە گریانێکەوە وەڵامی دایەوە:

- حاڵەتی ماڵەوە باش نییە؟

- هیچ کامێکمان باش نین. بەتایبەتی ئەمڕۆ لە جاران خراپتر بوو!.

هەموو قوتابییەکان پێکەنین! تەنیا من نەبێ کە لەمەبەستی حوسێن گەیشتبووم و لە داخا خەریك بوو بتەقم!.

مامۆستا پرسی:

- بۆ باش نیە؟.

حوسێن کە بەزەحمەت قسەی دەکرد، بە دەنگێکی پڕ کەف و کۆڵەوە وەڵامی دایەوە:

- چونکە.. چون.. کە.

نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات و بێدەنگ بوو.

مامۆستا لەسەرخۆ پرسی:

چون.. کە.. چی؟

- چونکە ناتوانین کرێی خانووەکە بدەین چونکە. خاوەن خانووەکە دەیەوێ دەرمانکات. دەنگی قاقای پێکەنینی منداڵان لە پۆلەکەدا دەنگی دایەوە.. حوسێنیش وەکو یەکێك لە کاتی دزیەدا مەچەکیان گرتبێ سەری بەردایەوەو بەرەو مێزەکەی چۆوەو دانیشتەوە من لەژێرەوە سەیرێکی مامۆستاکەمانم

کرد.. لەو داخ و ئازارەی کە دڵی کەیل کردبوو وەك پەیکەری مرۆڤێکی سیلاوی و نەخۆش دەهاتە بەرچاوان.

دوای ئەوەی تۆزێ خۆی ڕاگرت، بە دەنگێکی نزمەوە گوتی:

– کچە بچکۆڵەکە هەر کاتێ سەیری پەنجەرەی دراوسێیەکانی دەکرد دەیدیت وەکو ئەڵماس دەدرەوشێتەوە. دوایی لەپڕ قسەکەی خۆی بڕی و لە ئەمیری پرسی:

– ئەمیر تۆ بڵێ بزانم وشەی (ماڵ) لێرەدا چ حاڵەتێکی هەیە؟

– مامۆستا.. ما.. جەناب.. ماڵ.

مامۆستا لە مەحموودی پرسی:

– تۆ بڵێ ماڵ چ حاڵەتێکی هەیە؟

چونکە مەحموودیش ئاگای لە باسەکە نەبوو وەڵامی دایەوە:

– ماڵ شوێنێکە لێی دادەنیشین و شێوەی ( شەش پاڵووی هەیە!.)

دووبارە دەنگی پێکەنینی قوتابییەکان بەرز بۆوەو مەحموود کە تێگەیشت لێی تێکچووە بە مینگە مینگ قسەکەی ڕاست کردەوە:

– ماڵ هەندێ جار حاڵی باشەو هەندێ جاریش خراپ.

دیاربوو مامۆستاش هۆشی لە هەمووان پەرتترە بێ ئەوەی ئاگای لە وەڵامەکەی مەحموود بێت بە دەنگە بەرزو نزمەکەیەوە گوتی:

– باشترین ماڵ ماڵەکانی خۆمانن کە تێیاندا دەژین. پێویستە هەموومان نرخی ماڵی خۆمان بزانین دوای نیوەڕۆ کە لە قوتابخانە گەڕامەوە ماڵێ زۆرم دڵخۆشی حوسێن دایەوە. بەڵام تەنگژەی ژیان بە قسە دەرمان دەکرێت؟



ئەم هەفتەیە سەرم زۆر قاڵە ناتوانم لەوە زیاتر درێژە بە نامەکەم بدەم. با ئەمە بۆ هەفتەیەکی دی بێت.

هەوای ئەنقەرە چۆنە؟ لێرە باران دەبارێ. (حاڵ)ی ماڵەوەمان باشە (حاڵ)ی ماڵی ئێوە چۆنە؟ بە درێژی بۆم بنووسەوە

چاوەڕوانی وەڵامی نامەتم ئەوەی هەرگیز تۆی لەبیر ناچێ و خۆشی دەوێی

**ئەحمەد تاربای**

## درۆزن دوژمنی خوایە!...

ئەنقەرە (14)ی مایسی 1967

ئەحمەد گیان تەوازۆی دواکەوتنی نامەکەتت لێدەخوازم، خەریکی خۆ ئامادەکردنی تاقیکردنەوە بووم، هێندەم کۆشش کردووە خەریکە مێشکم دەتەقێ. هەرچی لە مێشکمدایە تێکەڵ و پێکەڵ بووە!.

بەڕاستی تاقیکردنەوە بەڵایەکی گەورەیە بۆ قوتابییان!.

سوپاس بۆ خوا باش بوو بە هەر کەڵەك و کولەکێك بوو لە تاقیکردنەوەی ئەمساڵ دەرباز بووم و بۆ ساڵێکی تریش خوا کەریمە.

دوا تاقیکردنەوەم دوێنێ بوو، ئەمڕۆ دەستم گەیی نامەت بۆ بنووسم.

لە نامەی پێشووتدا شتێکت دەربارەی حوسێن نووسیبوو. زۆرم غەم بۆ خوارد.. نامەیەکیشم بۆ ئەو نوسیوە و زۆرم دڵ داوەتەوە.

لەم ماوەیەدا کە نەمتوانیوە نامەت بۆ بنووسم زۆر شتی سەیرو سەمەرە لێرە ڕوویداوە.. بەڵام من لە یەکێك لەو ڕووداوانە زیاترت ناتوانم بۆ بنووسم، ئەم بەسەرهاتەش لە (مەتین)ی برامی ڕوودا. پێموابێ پێم گوتبووی کە مەتین زۆر درۆ لەگەڵ باوکمدا دەکات! کە باوکم درۆیەکانی مەتین دەبیسێ زۆر سەغڵەت دەبێ و هەموو جارێکیش ئامۆژگاری دەکات:

((کوڕەکەم هەرچی دەیکەی بیکە بەڵام درۆ مەکە.. لە دنیادا هیچ شتێك لە درۆزنی خراپتر نییە! درۆزن دوژمنی خوایە. کاتێ مرۆڤ درۆیەکی کرد بۆ شاردنەوەی درۆیەکەی ناچار دەبێ درۆی گەورەتر بکات و، دوای ئەوەی



درۆیەکەشی ئاشکرابوو درۆیەکی گەورەتر دەکات تا سەری ئەویدی پێ داپۆشێ. هەموو درۆیەك درۆیەکی گەورەتری دەبێ. و لە دواییدا مرۆڤی درۆزن لەناو شەپۆلی دەریای درۆیاندا نقوم دەبێ، هەر بۆیەشە هەموو ئایین و بیروباوەڕێکی ئەم جیهانە درۆ بە گوناهێکی زۆر گەورە دادەنێن)).

خۆشیەکەشی ئەوەیە لەگەڵ ئەو هەموو ئامۆژگاری و هەڕەشەو بگرەو بەردەەشدا جار جارە باوکم خۆی مەتین ناچار دەکات درۆیان بکات!.

بۆ نموونە هەر کاتێ یەکێك هاتبایە بۆ لای باوکم بەڵام ئەو نەیویستایە بیبینێ مەتینی دەنارد دەرگا بکاتەوەو دەیگوت:

((بڵێ باوکم لەماڵەوە نییە!))

بێگومان زۆر جارانیش گەندەی ئەو درۆ مەسڵەحەتیانەش وەدەر دەکەوتن! بەڵام باوکم هەرگیز بەسەرخۆی نەدەهێنا! هەروەك ئەوەی درۆی گەوران درۆ نەبێ!. و تەنانەت هەر منداڵان نابێ درۆ بکەن!

چەند ڕۆژێ بوو باوکم بە مەتینی دەگوت قژی کورت بکاتەوە. بەڵام چونکە مەتین لە دڵەوە ئەوەی پێناخۆش بوو هەر جارە پەڵپ و بیانوویەکی دەدیتەوەو دایدەتاشین.

دوێنێ بەیانی زوو باوکم هەرایەکی گەورەی نایەوەو گوتی:

((دەبێ ئێستا بچی قژت کورت کەیەوە)).

بەڵام مەتین ئەمجارەش هەر نەچووە ژێربار خوادەیزانی لەوانەشە لەیری چووبێ، دوای نیوەڕۆ کاتی هاتنەوەی باوکم مەتین هاتە لامەوەو گوتی:

- چ بکەم، وەڵامی چ بدەمەوە؟

گوتم:





– باشتر وایە ڕاستییەکەی بلێی درۆ سودی چییە؟

– ئەگەر ڕاستییەکەشی بلێم باوکم هەر توورە دەبێ.

– بلێ پارەکەم لێ ونبووە!

– جارێکیشم وا گوتووەو درۆیەکەم ئاشکرا بووە!

– بلێ دەفتەرو قەڵەمم نەبوو و پارەکەم دا بەوانە!

– ئەوەش نابێ. دوێنێ دەفتەرو قەڵەمی بۆ کڕیوم.

– ئەگەر بەمن دەکەی ڕاستییەکەی دەڵێی.

– نا قسەی ڕاست کەڵکی نییە! دەڵێم سەرتاشخانە زۆر قەڵەباڵغ بوو وەبەرم نەکەوت!. پێش ئەوەی من وەڵام بدەمەوە ئەو درۆیەشی پەسەند نەکرد!. چەند دانە درۆیەکی دیشی بە پەتێوە کردن بەڵام هیچیان هەر نەبوون.

باوکم ئاوالێکی هەیە ناوی ((زیا بەگە)) ئەو شەوە زیا بەگ بە خاو و خێزانەوە لە ماڵی ئێمە بوون. بەڵام وا ڕێککەوت باوکم تا درەنگانێك نەهاتەوە ماڵێ. سەعاتێك... دوو سەعات... سێ لەسەر وەختی هاتنەوەی ڕابرد، داکم خەریك بوو دڵە کوتە بگرێ، نەماندەزانی بۆ وا دواکەوتووە؟ میوانەکانیش تا دەهات وەگومان دەکەوتن. زیا بەگ پرسی:

– پێتان وایە چۆتە کوێ؟

دایکم هەر چەندە نیگەرانیش بوو، وەڵامی دایەوە:

– لە هەر کوێیەك بێت ئێستا پەیدا دەبێتەوە.

دیسانەوە ماوەیەکی دیش چاوەڕێمان کرد، سوسەیەکی هەر نەبوو.

ئیدی دایکم نەیتوانی خۆی ڕاگرێ:



– تا ئێستا نەبووە وا درەنگ بێتەوە.

ئەمجارەیان زیا بەگ کەوتە دڵدانەوەی دایکم:

– لەوانەیە کارێکی بە تووشەوە بوو بێ.

دایکم کە بە ئاشکرا ڕەنگی هەڵبزڕکا بوو، وەڵامی دایەوە:

– هەر چۆنێك بووە ماڵەوەی هەر ئاگادار کردۆتەوە.

من و مەتین نانمان خواردو چووین بنووین. زیا بەگ و خیزانەکەشی هەستان بڕۆن. لەم کاتەدا زەنگی دەرگا لێدرا.

دایکم بە هەڵەداوان ڕایکردە بەر دەرکێ و گوتی ((هاتەوە)).

زیا بەگ پیاوێکی گاڵتەچی و خۆش مەشرەب بوو و مەیلی ئەوەی بوو ئۆینێك بنێتەوە:

– ئێمە خۆمان دەشارینەوەو سەیرێکی خۆشتان بۆ دەکەم!

زیا بەگ و ژنەکەی چوونە ژوورەکەی دییەوە، دایکیشم کە دەرگاکەی کردبۆوە بە کەمێ پەشۆکاویەوە بە باوکمی گوت:

– ئەوە لە کوێ بووی خۆ ئۆقرەمان لێبڕا.

باوکم زۆر لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:

– زیا بەگ زۆر نەخۆشە حاڵی تا بلێی خراپە، چووم سەرێکی لێبدەم!.

دایکم خەریك بوو لە پێکەنینێدا بپسێ! بەڵام هەر چۆنێك بوو خۆی ڕاگرت و وەڵامی دایەوە:

– چۆن! خۆ خوا نەکردان خەتەر نییە! ؟.

– مەگەر خوا! دەنا تازە ڕابرد! خوا ڕەحمی پێبکا!.

باوکم هەر خەریك بوو نزای دەکردو بۆ زیا بەگ دەپاڕایەوەو ئاخی بۆ هەڵدەکێشا، کە ئەم و خێزانەکەی بە قاقاو حیلکە حیلکی پێکەنینێوە لە ژوورەکەی پێشەوە هاتنە دەرێ باوەڕ ناکەم ئەگەر ئیزرائیلیش بهاتبایەتە بەرچاوی، باوکم هێندە شڵەژابایەو تیکچووبایە! لە تەریقیاندا زمانی لاڵ بوو:

– بە ڕا... ڕاستی! ئەوە ئێوە... لێرەن..؟

زیا بەگ پێکەنی و گوتی:

– هەر ویستمان بۆ خۆمان سەیرانێك ساز کەین!.

دایکم بە پلارەوە لێی زیاد کرد:

– بەڕاستی سەیر هەروا دەبێ!.

باوکم لە شەرما قسەی نەکرد... لەگەڵ میوانەکان چووینە سەر خوان بۆ نانخواردنێ... مەتین لە ترسی ئەو نەهات و خۆی شاردبۆوە!

باوکم پرسی:

– مەتین نوستووە.

دایکم وەڵامی دایەوە:

– منداڵەکە لەبیری چوو بوو سەری چاك بکاو نەشیدەویست درۆ بکات بۆیە بێ شێو سەری نایەوە!

باوکم لە شەرماندا ئارەقەی بە نێوچەوانیدا ڕێچکەی کردبووە خوارەوە.

بەم جۆرە مەتین لە هەڕەشەو گوڕەشە ڕزگاری بوو، منیش زۆرم پێخۆش بوو بڵێم درۆزن دوژمنی خوایە، بەڵام نەموێرا.



هەمیشە لەبیری ئەوەدام ئەگەر لە تاقیکردنەوە دەرنەچم یا ئیکمال چ درۆیەکی ببینمەوەو لای باوکم و دایکم خۆمی پێ ڕزگار بکەم!

ئیشاڵڵا لەنامەی داهاتوودا سەرەنجامی تاقیکردنەوەشت بە درێژی بۆ دەنووسم.

**دڵسۆزت**

**زەینەب یالکەر**

# ئاهەنگی کۆتایی ساڵ

ئەستەمبۆڵ 27ی مایسی 1967

خوشکی خۆشەویستم. ماوەیەکە لێت بێ ئاگام، لەوانەیە بەوە ڕەنجابی کە وەڵامەکەت دوواکەوتووە؟ لە ڕاستیدا هەقتە، بەڵام ئەگەر هۆیەکەت بۆ ڕوون بکەمەوە تێدەگەی کە هێندە کەمتەرخەم نیم، بەڵکە چونکە خەریکی خۆ ئامادەکردنی گێڕانی ئاهەنگی کۆتایی ساڵ بووین و بەم بۆنەیەوە ئیش و کارمان یەکجار زۆرو پڕ تەنگوچەڵەمە بوو، بۆیە نە پڕژاوم نامەت بۆ بنووسم.

ئاهەنگەکەمان دوێنی دەستی پێکرد بەڵام نازانی چەند خۆش بوو! بەدرێژایی تەمەنم تا ئێستا هێندە پێنەکەنیوم!. خۆشییەکەشی لەو هەڵانەدا بوو کە دەمانکردن. گەورەترین هەڵەش من کردم کە هەر بەو هۆیەشەوە بە پاڵەوانی ئاهەنگەکە ناسرام!. تەواوی ئاهەنگەکە لەژێر چاودێری مامۆستای پۆلی سێیەمدا گێڕدرا. مامۆستای مۆسیقا هەڵپەرکێ و ئاوازەکانی ئامادە دەکرد. مامۆستای پۆلی چوارەمی ئێمەش شانۆگەرییەکی بۆ ئەو ئاهەنگە نوسیبوو ئەکتەرەکانی بریتی بوون لە قوتابییەکانی خۆمان.

لە ڕەنگ و ڕواڵەتی زۆر کەسانی گەورەدا ئەوەم بەدی کردووە کە هیچیان بە وەزعی ئێستای خۆیان ڕازی نین. تەنانەت باوکیشم هەر یەکێکە لەوانە. ئەمیش هەمیشە هەر سکاڵایەتی و دەڵێ: ((ئەگەر بمخوێندبایە ئێستا شاعیرێکی ناودار دەبووم))



مامم کە تاکنیسیۆنێکی زۆر باشە بەردەوام پەکو پوویەتی و پەشیمانە کە بۆچی وە دوای زانستی پزیشکی نەکەوتووە!.

مامۆستاکەی ئێمەش هەر لە ئیشەکەی خۆی ناقایلە و هەر کاتێ لە پۆلا قسە دێتە سەر ئەو دەڵێ: ((من دەبوو ببمە نووسەر!..)).

هەر بۆیەش بەڕێوەبەری قوتابخانە داوای لێکرد کە شانۆگەرییەك بۆ ئاهەنگی کۆتایی ساڵ بنووسێ و ئامادەی بکات. ئەمیش بۆ ئەوەی قسەکەی خۆی بسەلمێنێ چەند هەفتەیەك شەو و ڕۆژ هەر خەریك بوو تا شانۆگەرییەکی زۆر نایاب و ڕێکوپێکی ئامادە کرد. شانۆگەرییەکەش درامایەکی زۆر باش و بەهێز بوو کە ئەمەش کورتەکەیەتی:

((کوڕێك هەبوو نەیدەخوێند، لە قوتابخانە هەڵدەهات، لە ماڵەوەش دەبووە مایەی بەرپاکردنی ناخۆشی و کێشەو بەرەو خەم بۆ دایك و باوکی تا سەرەنجام برادەرایەتی ئاواڵی خراپ و بەرەڵڵا بەرەو قومار ڕایان کێشاو لە دواییدا تووشی بەندیخانە بوو. دایکی بەرگەی ئەو هەموو شوورەیی و ڕیسواییە ناگرێ و لە داخان دەمرێت و وەزگ دەدا. کوڕەش پاش ئەم هەموو بەسەرهاتانە تۆبە دەکات کە دەست لە کاری ناشایستەو نالەبار بکێشێتەوە، کاتێ لە بەندیخانە ڕزگاری دەبێت و دەچێتەوە لای باوکی داوای لێبوردنی لێدەکات. پیرەباب بەچاوی پڕ فرمێسکەوە دەڵێ:

((باوك هەمیشە لە جگەرگۆشەی خۆی دەبووری. بڕۆ گەردەنت ئازاد بێ. بەڵام باوکەکەش هەروا لە داخان بەردەبێتەوەو ئەویش دەمرێ!)).

کاتێ مامۆستا ئەم شانۆگەرییەی لە پۆلدا بۆ دەخوێندینەوە فرمێسك وەك تاوی بارانێ بە چاوی قوتابییەکاندا دەهاتە خوارێ. بە مامۆستاکەمانم گوت:

– مامۆستا ئەگەر شانۆگەرییەکی کۆمیدیت ئامادە بکردایە باشتر نەبوو؟

ئەو قسەی زۆر پێناخۆش بوو و وەڵامی دایەوە:





– ئەحمەد تۆ هەمیشە بەرهەڵستی پیاو دەکەی. لە ئاهەنگی قوتابخانەدا نابێ شتی گاڵتەجاڕی پێشان بدرێت!.

دیارە مەبەستی ئەوە نەبوو شانۆگەرییەکە کۆمیدییەکی وا بێت وەك ئەو تێگەیوە، بەڵکو دەمویست بڵێم لە جیاتی ئەوەی ئێمەی منداڵ ڕۆڵی گەوران بگێڕین، شانۆگەرییەك پێشکەش بکەین پەیوەندی بە منداڵانەوە هەبێت و ناوەڕۆکەکەشی لەدەوروبەری قوتابخانە ڕووی دابێ! چونکە لە ئاهەنگەکانی پێشووتردا دیتبووم کە گێڕانی ڕۆڵی گەوران و ڕیش و سمێڵ پێوە لکاندن چەند دەردەسەرییەکی گەورەو گرانە، بەڵام نەمتوانی مەبەستەکەمی تێبگەیەنم.

ئەو منداڵانەی کە ڕیش و سمێڵ بەخۆیانەوە دەلکێنن و جل و بەرگی گەوران لەبەر دەکەن وەك ئەکتەرێکی سێرك دێنە بەرچاو، و هەرچەندە شانۆگەرییەکەش غەمناك و درامی بێت دیسانەوە هەر بەشێوەی کۆمیدی دەریدەخەن و خەڵکی دێننە پێکەنین!. بەڵێ دەمویست بڵێم هەر نەبێ شانۆگەرییەکە وابێ وەزع لە خەڵك تێك نەدا! بەڵام کاتێ مامۆستا سەرزەنشتی کردم ئیدی بێدەنگ بووم.

ئەو شانۆگەرییەی کە دەمانویست پێشکەشی بکەین پێنج پەردە بوو و لەبەر ئەوەش کە مامۆستا قسەکەی منی پێناخۆش بوو گوتی:

((تۆ ڕۆڵێ کوڕە لاسارەکە دەگێڕی. چونکە چاکی لێدەزانی)). بڕیاریش درا (دەمیر ) ڕۆڵی باوك و (مینا)ش ڕۆڵی دایك بگێڕێ.

هەرکەسەو ڕۆڵی خۆی نووسییەوەو لەبەریکرد. دەستمان کرد بە پرۆڤە کردن لەسەر شانۆ ڕۆژی ئاهەنگەکە کە خەریکی گێڕانی شانۆگەرییەکە بووین باران دایدا.

لەبیرمە کە هەرچەند باران دەباری چۆن ئاو لە قەڵشت و کون و کەلەبەرەکانی شانۆیەکەوە دەهاتە خوارێ. ئەو ڕۆژەش هەروەك شانۆیەکە



بنمیچی نەبووبێ دەڕێ و ژووڕێ وەك یەکی لێدەباری. بۆ ئەوەی جل و بەرگی منداڵە ئەکتەرەکانیش تەڕ نەبن چەند لەگەن و بادی و سینییەکیان نایە بەر تکەی دڵۆپەکان.

شانۆگەرییەکە سەمایەکی چینی تێدا بوو، هەرچەندە ئەو سەمایەش هیچ پەیوەندییەکی بە باس و ناوەڕۆکی شانۆگەرییەکەوە نەبوو، بەڵام چونکە مامۆستایەکەمان لە ئاهەنگی یەکێك لە قوتابخانەکاندا دیتبووی و وەبەر دڵی کەوتبوو بۆیە ئاخنیە شانۆگەرییەکەیەوەو گوێشی نەدایەکەس.

ئەم سەمایە لەژێر ئەو باران و لەناو ئەو لەگەن و بادی و سینیەشدا دەبوو بکرێ. تەختەکانی ڕووی شانۆکەشت لەبیرە؟ کە قرچە قرچیان دەهات دەتگوت قرشەیەو جەنجەڕی بەسەردا دەڕوات؟ سەمای چینیش زۆر ئارام و بێ هەست و قورس و لەسەرخۆ دەگەڕێ. بەڵام من هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی خۆم ڕاگرم و لەکاتی پرۆڤەدا بەپەلە خۆم بادەدا و دەخولامەوە! مامۆستاکەشمان لە پشتەوە هەر هەڕەشەی دەکرد: ((ئەحمەد لەسەرخۆ!. خۆت هەڵمەدە. لەسەرخۆتر بجولێرەوە)).

نازانم ئەو ڕۆژە چۆن لەناوەڕاستی سەماکەدا هەڵپەڕکێی خۆمانەم بەبیردا هاتەوە، بێ ئاگا دەستم بە هەڵپەرکێیەکی خۆمانەی گەرم کرد.

مامۆستای سەما زۆر تووڕە بوو، دەیویست بۆ لای من بێت لە لەگەنێکی پڕ ئاوی قوڕاوی هەڵەنگوت و بە جل و بەرگی منداڵەکاندا هەڵپڕژا!. منداڵەکان کە جلەکانیان قوڕاوی لێدەچۆڕا بە پیس بوونی جلەکانیان زۆر سەغڵەت بوون.

کاتی دەست پێکردنی بەرنامەی ئاهەنگەکە تا دەهات نزیکتر دەبۆوە. ئێمەش هەموومان لەخۆشی و چاوەڕوانیدا دەکولاین. لە کونی پەردەی شانۆکەوە تەماشایەکی ناو هۆڵەکەم کرد دەرزیت هەڵدابایە نەدەکەوتە عەردی. دایك و





باوکی تێکڕای قوتابییەکان.. بەڕێوەبەری پەروەردە.. بەڕێوەبەرانی قوتابخانە سەرەتاییەکان و هەموو مامۆستاکانیش بۆ ئەو ئاهەنگە هاتبوون.

بەشی یەکەم سروودێکی میللی بوو کە بە هاوبەشی پەنجا قوتابی دەگوترا. کاتێ سروودە میللییەکە تەواو بوو پەردە دادرایەوە.

ئێمەش بۆ خۆگۆڕین چووینە ژووری خۆ گۆڕین و دوازدە قوتابیش لەسەر شانۆکەمانەوە تا بەشی دووەمی ئاهەنگەکە پێشکەش بکەن. بەشی دووهەمیش سروودی منداڵان بوو.. ئێمە لە ژووری خۆ گۆڕینەوە گوێمان لە دەنگی ئافەرین و چەپڵە ڕێزانی میوانەکان بوو.. بەڵام مامۆستای مۆسیقا لە سروود گوتنی منداڵەکان قایل نەبوو و گوتی: ((ئەوە چۆن سروود گوتنێك بوو؟ کەی من وام فێرکردبوون؟ لەجیاتی دوو دەنگی بووە دە دەنگ!)). بەشی سێیەم سەما چینییەکە بوو. کچەکان جل و بەرگی ئاوریشمینی درێژی ئاودامانیان لەبەر کردبوو سینییە گەورەکانی دەستیان بە جووڵانەوەیەکی تایبەتی بەولاولادا دێناو دەبرد. کوڕەکانیش دەموچاویان بە ڕەنگێکی تایبەتی چینیانە ئارایشت دابوو و سمێڵی درێژیان بەسەر لێوەکانیاندا بەردابوونەوە.

پەردە لادرا، مامۆستای مۆسیقا دەستی بە پیانۆ لێدان کرد. ئێمە هاتینە سەر شانۆ... کچەکانیش بەدوای ئێمەدا هاتن. لەکاتێکدا کە سینییەکانیان بە دەستەوە بوو، دەستیان کرد بە پێشکەشکردنی سەمایەکە. لەو کاتەدا شتێك ڕوویدا!.

دامێنی کراسی یەکێك لە کچەکان لە درزی تەختەی سەر شانۆیەکە گیر بوو و کچەکە زۆری هەوڵ دا لە درزی تەختەکەی دەربێنێتەوە بەڵام بێ سوودبوو.. لەخۆی نووسا، کراسەکەی لێ داماڵڕاو کەوتە سەر عەردی!.

کچەی بێچارە بە دەرپێی کورتەوە لە ناوەڕاستی شانۆکەدا مایەوە.. دەنگی پێکەنینی میوانەکان لە هۆڵەکەدا بەرز بووەوە.. مامۆستای مۆسیقاکە لە



جێیەکی نەدیوەوە پیانۆی لێدەدا هاواری کرد: ((پەردەکە دادەنەوە)). بەڵام کەس ئاگای لەو نەمابوو و گوێی نەدەدایە قسەکانی. هۆش و گۆشی هەمووان بەلای کچەکەوە بوو! لە دواییدا لەگەڵ چەپڵە ڕێزانی میوانەکاندا پەردە دادرایەوە! بەم جۆرە کۆتایی بە بەرنامەی گۆرانی و سەماکردن هات و نۆرە گەییە سەر پێشکەشکردنی شانۆگەرییەکەی ئێمە.

مامۆستاکەی ئێمە خۆی ماکیاجی قوتابییەکانی بە دەستی خۆی کرد. (مینا)ی وا ئارایشت دابوو هەر دەتگوت پیرێژنێکی هەشتا نەوەد ساڵەیە. بۆ (دەمیر)یش کە ڕۆڵی باوکی منی دەگێڕا ڕیش و سمێڵێکی سپی لە لۆکە دروستکرد.. منیش دەبوو تەنیا هەر سمێڵم هەبایە، لەبەر ئەوەش کە لە پێشدا مامۆستا کەتیرەی کەم لێدابوو سمێڵەکەم ڕانەدەوەستاو بەردەبۆوە.. سەرلەنوێ مامۆستا تەپاڵتەیەکی دیکەی کە تیرە لە لێوی سەرەوەم هەڵسوویەوەو سمێڵەکەی ڕاگرت. دوای ئەوەی ئارایشت تەواو بوو مامۆستاکەمان گوتی:

– دەمیر دەبێ چاویلکەیەکی زەرەبینیش لەچاوان کات تا زیاتر بە پیران بچێ. لەپێشدا هیچ بیریان بۆ ئەوە نەچوو بوو و ئێستاش نازانن چاویلکە لەکوێ پەیداکەن. جەنابی بەڕێوەبەری قوتابخانە چاویلکەکەی خۆی دانێ و گوتی:

– ڕۆڵە زۆر وریابە نەیشکێنی. من بەبێ چاویلکە هیچ نابینم.

کاتێ دەمیر چاویلکەی لەچاوان کرد ڕاست بووە پیرەمێردێکی تەواو، بەڵام عەیبەکەی ئەوە بوو هیچ جێیەکی نەدەدی. کاتێ پەردە لادرا، دەمیر ڕێی لێ ون بوو، نەیدەزانی روو لە کوێ بکات، لەسەرخۆ بەرەو شانۆکەوەم دەست ڕاکێشا.

پەردەی یەکەم باش ئەنجام درا: بەڵام پەردەی دووەم کەمن تێیدا ئازاری دایکمم دەداو باوکم پێویست بوو ئامۆژگاری من بکات دەمیر لەسەر شانۆیەکە ئێمەی لێ ونبوو! لەجیاتی ئەوەی ڕوو لەمن کات، پشت لە خەڵك و ڕوو لە دیوار دەستی بە قسان کردو کەوتە قسە: ((ڕۆڵە بەستەزمانەکەم زۆرمان زەحمەت پێوە کێشاوی)).

لێی نزیك بوومەوەو لەسەرخۆ گوتم:

- ((ئێمە لێرەین)).

بەڵام ئەو ئاگای لێنەبوو.. دەستمکرد بە هەراو هۆریا و جنێو و لێدانی دایکم تا دەمیر بەلای ئێمەدا وەرچەرخێتەوە بەڵام بێ سوود بوو. دەمیر هەر لەگەڵ دیوارەکەدا دەدوا:

((لە دایکت مەدە.. شەرمێ لە خۆت بکە.. لە خودای بترسێ.. ئەی فرزەندی لەخوا نەترس!))

من دەنگم بەرز کردەوە.. ئەوەش قەیناکا کە هەر ئاگای لێنەبوو! لە دیوارەکە نزیك بووەوەو مستێکی لە دیوارەکەوە سرەواند!! میوانەکان دەستیانکرد بە پێکەنین.. منیش پێکەنین گرتمی. ڕۆڵی خۆم لەبیرچۆوەو بە دەنگی بەرز گوتم:

- بابە من لێرەم.

دەمیر منداڵێکی بەهۆش بوو وەڵامی دایەوە:

- نامەوێ سەرو سەکوتت ببینم.. قینم لێتە.. ئەی منداڵی لاسارو نالەبار...

لە دڵی خۆمدا گوتم مادامەکی پێیزانی بەلای ئێمەدا وەردەچەرخێتەوە. بەڵام دیسانەوەش ڕووی هەر وەرنەگێڕایەوە.. تا دەهات ئیشەکە خراپتر



دەبوو. دەمیر هەروا جنێوی بەدەرو دیواران دەداو منیش هەر زیاتر دەمقیژاند: ((بابە من لێرەم)).

تا لە دواییدا بەگوێرەی شانۆگەرییەکە دایکمم کوشت و کەوتە سەر عەردی شانۆیەکەو باوکم بەپەلە کوتێ لە دایکم دەگەڕاو دەیگوت: ((لە کوێی؟))

دایکم کە زانی باوکم نایدۆزێتەوە خشکەیی بەرەو لای ئەو خۆی خزاندو گوتی:

((لێرە کەوتووم... مردم!))

میوانەکان لەبەر پێکەنین قامکت برییان ئاگایان لێنەبوو!. هەراو هوریایەك لە هۆڵەکەدا پەیدا بوو ئەو سەری دیار نەبێ!

دیسانەوە مامۆستاکەمان لە پشتەوە قیژاندی: ((پەردەکە دادەنەوە)). بەڕێوەبەر هاتە پشتی شانۆکەوە و لەگەڵ دەمیردا کردییە هەرا: ئەو گاڵتە بازاڕییە چ بوو گێڕات؟

دەمیر گوتی:

قوربان چ بکەم بە چاوێلکەوە هیچم نە دەدیت.

- باشە لەمەودووا بەبێ چاوێلکە ڕۆڵەکە بگێڕە.

مامۆستاکەمان بەر پەرچی دایەوە:

نابێ قوربان.. دوو پەردەیان بە چاوێلکەوە بووە ئێستاکە پەردەی سێیەمە پیرتر بووە و مردنی نزیك بۆتەوە چۆن دەبێ بێ چاوێلکە ڕۆڵ بگێڕێ! ؟

بەڕێوەبەر دیتی ڕاست دەکات گوتی:

- ڕۆڵە لە ژێر چاویلکەکەوە سەیرکە.

دەمیر نەیدەزانی چۆن لەژێر چاوێلکەکەوە بڕوانێ. بەڕێوەبەر دەمیری فێرکرد چۆن دەبێ و گوتی:

– زۆر وریابە نەکو چاوێلکەکە بشکێنی!

لەپەردەی سێیەمدا هیچ هەڵەیەك ڕووی نەدا بەڵام چونکە خەڵکەکە لە پێشا پێکەنین گرتبوونی هەر قسەیەکمان دەکرد دەستیان بە پێکەنین دەکردەوە.

لەم پەردەیەدا من لە بەندیخانە دەهاتمە دەرێ.. لە کردەوەکانی خۆم پەشێمان دەبوومەوەو دەمویست داوای لێبوردن لە باوکم بکەم.

ئەم شوێنەی شانۆگەرییەکە پێکەنینی نەدەویست بەڵام خەڵکەکە هەر پێدەکەنین! کاتێ داهاتمەوە دەستی باوکم ماچ کەم دەزانی چیم دیت؟. دەبینم ئەوا لا سمێڵێکم لەسەر عەردی کەوتووە، خۆ ناشبێ بە لاسمێڵێکەوە ڕاست ببمەوە گوتم:

– بابە ڕاوەستە قاچەکانت ماچ کەم.

لەسەر عەردەکە درێژ بووم و تاکە سمێڵەکەم هەڵگرتەوەو دەمویست پێوەی نێمەوە بەڵام بە لێومەوە نەدەنووسایەوەو هەر دەکەوتەوە. کە زانیم بێ سوودە سمێڵەکەم هەروا بە دەستەوە وەکو ئەوانەی دەست بە سمێڵیان دادێنن کەوتمە یاری پێکردنی. دەمیر بە گوێرەی ڕۆڵی خۆی منی بەخشی و ئێمەش دەبوو دەست لە ملی یەکتری کەین.

کە تەماشام کرد دیتم دەمیر وەك لافاوێ فرمێسکی بە چاواندا دێتە خوارێ! و بەڕاستی دەگری. میوانەکانیش هەموو کەوتبوونە ژێر تین و تاوی هەڵوێستەکەو بێدەنگ چاویان بڕیبووە شانۆیەکە. تۆ مەزانە چاوێلکە زەڕەبینەکە چاوی تێکداوەو فرمێسکی هاتوونە خوارێ! دەمیر باوەشی کردەوەو یەکترمان لە ئامێزگرت و یەکترمان ماچ کرد.. کاتێ لێك دووركەوتینەوە دیتم ئەو ڕیشەدەستکردەی بە دەموچاوی باوکمەوە لکێنراوە هیچی پێوە نەماوە. منیش ویستم دەستێك بە سمێڵەکانمدا بێنم دەبینم ئەویش نەماوە! ڕیشەکەی دەمیر بە دەموچاوی منەوە لکاوە!!! ئێستا من شێوەی باوکم گرتووە!



بەگوێرەی بەرنامەکە دەبوو باوکم بکەوێتە سەر زەوی و بمرێ! بەڵام ئەو وەك قیسپی ڕاست لە جێی خۆی چەقیبوو، لەسەرخۆ گوتم:

((دەمیر بکەوە و بمرە!))

– ڕیشەکەی من بە تۆوە لکاوە تۆ بوو ویتە باوك!

– نە، بابە خۆت باوکی، خێراکە بمرە.

دەمیر دیسانەوە نەچووە ژێر بارو گوتی:

– تۆ دەبێ بمری.

خەڵکی هۆڵەکە دیسانەوە دەستیان کردەوە بە پێکەنین! دیتم هەموو ماندوو بوونەکەمان خەریکە بە فیڕۆ دەڕوات چوومە پێشەوەو گوتم:

– ئیشەکە تێك مەدە... خێراکە خۆت بەردەوە.

دەمیر دیسانەوە دوو دڵ بوو گوتی:

دەترسم خۆم بەردەمەوە چاوێلکەکە بشکێ!.

– قیڕوسیا.. خێراکە بمرە با ئەم کارە گووتێبووە ببڕێتەوە!

دەمیر دەستیکردەوە بە ڕۆڵەکە:

– کوڕی خۆم ئەوا من لێت خۆش بووم خواش لێت خۆش بێ. ئەمەی گوت و زۆر لەسەرخۆ چاوێلکەکەی داکەندو بە وریاییەوە دایناو گوتی:

– ئەوا خەریکە دەمرم!

کەوتە سەر زەوی! دیسانەوە دەنگی مامۆستا لەو لاوە بەرز بووە وە: ((پەردەکە دادەنەوە)).

کاتێ پەردە دادرایەوە دەمیر وەك مردووان ڕاستبۆوەو گوتی:

– ئەحمەد لە هەردووکمان قەوما، بەڕێوەبەر دەمارمان دەردێنێ... بەترس و لەرزەوە چووینەوە ئەو دیوی شانۆیەکە، بەڕێوەبەر و مامۆستا لە پێکەنیناندا چاویان پڕ بوو بوو لە ئاوو بە ڕوویاندا دەهاتە خوارێ.

خەڵکی هۆڵەکەش وایان چەپڵە لێدەدا هۆڵەکەیان وەلەرزە هێنا بوو!

دوو پاداشتی باشی نەزانینەکەمانیان داینێ! و بەرنامەی مامۆستاش چاکترین پاداشتی شانۆگەری منداڵانی بردەوە.

ئێستا تێگەیشتم کە پیاو لەوانەیە لە ڕووی نەزانییەوە کارێك ئەنجام بدا سەرەنجامەکەی زۆر لە ئی ئەوە باشتر بێ کە سەری لە ئیشەکە دەردەچێت و دەزانێ!!.

ئەمساڵ هاوینی ئەستەمبۆڵ زۆر خۆشە. هەوا زۆر باشە ئیشاڵلا لە پشووی هاویندا لە ئەستەمبۆڵ پێك دەگەین.

**سەرکەوتنت لە خوا دەخوازم**

**ئەحمەد تاربای**



## گرەوی چیرۆکی منداڵان...

ئەستەمبۆڵ 2ی حوزەیرانی 1967

خوشکی خۆشەویستم زەینەب، دوێنێ نامەیەکم بە پۆستەدا بۆ ناردی، ئەمڕۆش نامەیەکی تر دەنێرم. ئەگەر بە قسەم بکەی دەتوانین پێکەوە کارێکی گرنگ بکەین. بیستوومە پێشبڕکەیەکی چیرۆکی منداڵانیان ڕێکخستووە، دەزانی منیش چیم ڕەبەر چاو گرتووە؟. ئەو نامانەی کە بۆ یەکترمان نوسیون کۆیان بکەینەوەو بیانکەین بە کتێبێك.

بەڵێنت دەدەمێ کە لە تەواوی ئەو چیرۆکانەدا کە تا ئێستا بۆ منداڵان نوسراون باشتر دەربچێت و پاداشی باشترین چیرۆکی منداڵانیش وەدەست بێنین.

وەك تۆ چۆن لە نامەیەکدا بۆت نووسیبووم کە نامەکانی منت لە دۆسیەیەکدا هەڵگرتوون منیش هەموو ئەو نامانەم کۆ کردوونەوە کە تۆ بۆت ناردووم. بە زوویی ڕای خۆتم بۆبنووسە بزانم داخوا پێت خۆشە هاوبەشی ئەو پێشبڕکێیە بکەین یان نا؟. ئەگەر لەگەڵ ڕایەکەی مندا بووی تەواوی نامەکانم بە پۆستەی هەواییدا بۆ ڕەوانە بکە. پێویستە تا زووەو جێگا ماوە بچم و ناوی خۆم بنووسم.

لەم پێشبڕکەیەدا بەناوی هەردووکمانەوە هاوبەشی دەکەم و دڵنیاشم کە دەیبەینەوە... تکا دەکەم ئەم قسەیە لای هیچ کەس نەدرکێنیت.





ئەگەر پێشبڕکەکەمان بردەوە پێشەکی مژدە بدەینە کەسوکارمان!. ئەگەر نەشمان بردەوە هەر نەبێ ئابڕوومان نەچێ و لەلای دۆست و ئاواڵ و کەسوکارەکانمان سەرشۆڕ نەبین. سڵاو بە تەواوی ئاواڵانی هاوپۆل بگەیەنە.. لەسەر ئاو و ئاگران چاوەڕێی وەڵامتم.

**ئاواڵی هاوپۆلت**

**ئەحمەد تاربای**



## تۆش هەر یەکەم دەبی!

ئەنقەرە 6ی حوزەیرانی 1967

ئاواڵی میهرەبانم ئەحمەد. چەند سەعاتێك لەمەوپێش نامەکەتم پێگەیشت. لەو بیرەی کردۆتتەوە زۆر دڵشادم و بێ یەکودوو لەگەڵتدام. تەواوی نامەکانتم بێ کەم و زیاد کۆکردوونەتەوەو بۆتیان دەنێرم. بەڵام تەنیا لە شتێك دوو دڵم دەزانی چییە؟ ئێمە لە نامەکانماندا هیچمان نەهێشتۆتەوە، بە مامۆستاکانمان و دایك و باوکانمان نەڵێین. کاتێ ئەوان ئەمانە بخوێننەوە ئیدی ئێمە بە چ چاو و ڕوویێکەوە سەیریان بکەین. ئەوەی دایك و باوکمان هیچ با تا دەتوانن تووڕە بن بەڵام ئەدی مامۆستاکانمان؟!

ڕاستییەکەی ئەگەر تەنانەت تۆزێك وێژدانیان هەبێ لەو ڕاستگۆییەی ئێمە نیشانمان داوە چاو دەپۆشن و نمرەی تاقیکردنەوەکانمان بە تەواوەتی دەدەنێ؟!

هەرچۆنێك بێت دڵم نایە لەگەڵ ڕایەکەت نەبم. تەنانەت پێشنیاریش دەکەم کە ناوێکی دیکە بۆ خۆت هەڵبژێری و لە خوار نامەکانی خۆتیانەوە بنووسی. لێیگەڕێ با من هەر ( زەینەب )بم چونکە من بۆ خۆم هەڵمبژاردۆتەوە. لەبارەی بردنەوەی پێشبڕکێیەکەش هیچ دوو دڵ مەبە ڕاست یەکەم دەبین، ئەگەر دۆڕاندیشمان قەیدی چییە؟ بۆ سەرشۆڕ دەبین!

کاتێ کە خەریکی پێچانەوەیان بووم تەماشای هەندێکیانم کردەوە بەڕاستی شتی باشیان تێدایە بە تایبەتی ئەگەر بە ڕێکوپێکی و یەك بە دوای یەکدا لەچاپ بدرێن بە تامتر دەبن. من تا ئێستا چیرۆکی منداڵانم زۆر خوێندوونەوە بەڵێنت دەدەمێ هیچ کامێکیان وەك ئەم ڕۆمانەی ئێمە نابن.





ئەگەر ڕۆمانەکەشمان نەیبردەوە لە دواییدا تۆ یەکەمی وەدەست هەر دێنی، چونکە تۆش ڕۆژێك لە ڕۆژان دەبیتە باوك و بە مندالّەکانت دەلّێی کە لە پۆلدا هەمیشە هەر یەکەم بوو وی!)).

نامەوێ لەمە زیاتر لەم بارەیەوە پالّت پێوەنێم، بەلاّم بەو مجێزو ئارەزووە فراوانەی لەگەلّ نووسیندا هەتە دلّنیات دەکەمەوە سەر دەکەوین.

**سەرکەوتنت دەخوازم، سلاّوم بە تەواوی ئاوالاّن بگەیەنە**

**زەینەب یالکەر**

## پەیامی نووسەر بۆ منداڵان

منداڵە خۆشەویستەکان.. سەرتان سوڕنەمێنێ کە من ئێوەم هەموو وەکو منداڵەکانی خۆم خۆشدەوێن. نەك هەر منداڵانی نیشتمانەکەی خۆم بەڵکە منداڵانی تەواوی ئەو دنیایەم هەموو خۆشدەوێن.

دیارە هەمووتان ڕاستی بەسەرهات و ڕووداوەکان دەزانن و پەیتان بە چۆنیەتی مەسەلەکان بردووە.

دیسانەوەش دەمەوێ بۆ ڕوون بوونەوەی باسەکە شتێکتان هەر پێ بڵێم. ئەو نامانەی کە بە زمانی سادەو خۆمانە لە دەمی زەینەب و ئەحمەدەوە لەم کتێبەدا خوێندووتانەتەوە بەڕاستی دەستکردی ئەو دووانە نین بەڵکو هەمووی من نوسیومن و ئەو ناوانەش هەر خۆم دامناون. دیارە باش دەزانن کە دوو قوتابی پۆلی پێنجەمی سەرەتایی ناتوانن نامە بەو ڕێك و ڕەوانییە بنووسن بەڵام من دڵنیام ئەگەر ئێوەش ئەو نامانەی کە بۆ ئاواڵەکانتانیان دەنووسن کۆکەنەوە، ناوەڕۆکەکەی زۆر لەم داستانەی من سەرنج ڕاکێشتر دەبێ، چونکە ئێوە لە نووسینەکانتاندا راستی دەردەخەن و داستانەکەی ئێوە سەرتاسەری هەر ڕاستی دەبێ.

گەورەترین جیاوازی نێوان منداڵان و گەوران ئەمەیە، دڵ و دەروونی ئێوە هێشتا لە دوو ڕوویی و فێڵ و کەڵەکەبازییەوە نەگلاوە.

لەم کتێبەدا من هەوڵم داوە کە خۆم لە جێی ئێوە دانێم و بەزمانی ئێوەشەوە ڕاستییەکان دەربڕم، جا نازانم تا کوێ سەرکەوتووم.. بەلای خۆمەوە باشێکی واش نییە. چونکە گەورەو بچووك زۆریانساڵ نێوانن و لەهەر دەمێکی ئەو



ساڵانەشدا گۆڕانێکی زۆر لە گیان و دەروون و بیرو مێشکی ئادەمیزاد دا ڕوو دەدات و زۆر شتیش بیر دەچێتەوە.

لەڕاستیدا ئەم ڕۆمانە کە لەنامەکانی ئەحمەدو زەینەبەوە پێك هاتووە لە پێشبڕکەی کتێبی منداڵاندا هاوبەشی کردووەو پاداشتی یەکەمیشی وەدەست هێناوە.

ئەو ڕەخنانەی کە من لەم کتێبەدا نووسیومن وەکو ئامۆژگارییەکن گەورەکان بە بچووکەکانی دەکەن. گەورەکان بە خوێندنەوەی ئەم داستانە زۆر دڵخۆش نابن بەڵام چیبکەین ویژدان و ڕاست بینییەکی زۆری دەوێ تا مرۆڤ پەی بە هەڵەکانی خۆی دەباو پێ لەو خوار و خێچیانەی خۆی دەنێ کە خەڵکی دی تێیدا دەبینن و پێی دەڵێن.

دەبێ شتێکی دیکەشتان بۆ بنووسم!

من لەم داستانەمدا ئێوەی منداڵە خۆشەویستەکانم بە چاوی گەورانەوە تەماشا کردووەو تێیدا هەوڵم داوە هەموو شتەکان بە زمانی ئێوە خۆتان ئەنجام بدەم بۆیەشە ئێوە لەمەبەستی من دەگەن کە ویستوومە چ بڵێم.

ئەمە هەموو ئەو شتانە بوون کە من ویستبوومن و هیواداریشم دڵە بچکۆڵانەکانتان کە ئاوێنەی پاك و بێگەردن هەرگیز لەکەی خراپە و پیسی نەگرن و ئەوەش بزانن کاری خراپ هەر خراپە جا چ مامۆستا بیکات... و چ دایك و باوکمان کە خۆشەویسترین کەسی منداڵانن... پەند وەرگرن و هەرگیز وەدووی کاری خراپە مەکەون.

لە کۆتاییدا ئارەزوومەندی سەرکەوتنتانم.

**عەزیز نەسین**